بەرکولێکی

# فەرهەنگی زاراوە پیترۆلیيەکان

## زەویزانی و کیمیا

جەمال عەبدول

بەرگی ١

ئینگلیزی – عەرەبی – کوردی

## سوپاس بۆ :

براو هاوخەمی ئازیزم، کاکە (دکتۆر فازیلی ئەحمەدی ئەمینی لاوە)، کە لەکاتی دیدەنییەکیدا، لە بواری بەسەرکردنەوەو دیدەنی و پرسی کارو بەرهەمی نوێمدا، باسی ئەم فەرهەنگە هاتە ناوەوەو داوای کرد کە چاوێکی پێدا بخشێنێتەوە منیش (بۆ یەکەمجار) ئەم بەرکولە بەرهەمە هەژارانەیەم دایەو پاش چەند رۆژێك پێیدا چووبووەوەو هەندێ وردە تێبینی و پێشنیازو ڕوونکردنەوەی بەسوودی خستبوە بەرچاوم و ئەم نامەجوانەیشی لەگەڵ نووسیبوو ، پڕبەدڵ سوپاسی دەکەم و وێنەی زۆر بێت:

زۆر بەرێزو خۆشەویست، مامۆستا جەمال عەبدول ئەم کاتەت باش، و هیوادارم هەمیشە لەشساغ و تەمەندرێژ بیت .

مامۆستا گیان

پێشەکی دەستت خۆش بێت بۆ ئەو دەستپێشخەرییە پڕ بەهایە لەم بوارە گرنگەدا کە کتێبخانەی کوردی زۆر دەوڵەمەند دەکات و زۆر سوپاسی بەرێزتان دەکەم بۆ ئەم هەموو ماندوو بوونەو ئەم هەموو وردەکارییە،کە بەڕاستی کارێکی ئاسان نییەو زۆر سوود بەخشە بۆ سەرجەم زانستخوازان و کارمەندانی بواری نەوت، هەروەها سوپاسی بەرێزتان دەکەم کە ئەم دەرفەتەتان پێ دام بۆ بینینی ئەم شاکارەو ڕێگاتان پێدام بۆ ئەم چاوپێداخشانەوەیەو هیوادارم پێشنیازەکانم سوود بەخش بن.

مامۆستای ئازیزمان: هیوادارم بەزووترین کات ئەم فەرهەنگە بکەوێتە کتێبخانەی کوردییەوەو وەك بلێسەیەك پرشنگ بداتەوە بۆ هەمووان.

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزو سوپاسدا

**براتان/ فازیل ئەحمەد ئەمین لاوە**

**٧ /٧/ ٢٠١٢**

زۆر بەڕێز و خۆشەویستم مامۆستا جەمال عەبدول

ئەم کاتەت باش ...
وە هیوادارم هەمیشە لەش ساغ و تەمەن درێژ بیت،
مامۆستا گیان
پێشەکی دەستت خۆش بێت بۆ ئەم دەستپێشخەرییە
بە چاپی ئەم بوارە گرنگەدا کە کتێبخانەی
کوردی زۆر دەوڵەمەند دەکات.
وە زۆر سوپاسی بەڕێزتان دەکەم بۆ ئەم هەموو
ماندوو بوونەتان و هەموو ووردەکاریە...
کە بەڕاستی کارێکی ئاسان نییە و زۆر سوودمەندە
بۆ هەرچی زانستخوازان و کارمەندانی بواری
نەوت. هەروەها سوپاسی بەڕێزتان دەکەم
کە ئەم دەرفەتەتان پێدام بۆ پێشینی ئەم
شاکارە و ڕێگاتان پێدام بۆ ئەم چاپی پێشەکییەوە
وە هیوادارم پێشنیازەکانم سوودبەخش بن.

مامۆستای ئازیزمان :
هیوادارم بە زووترین کات ئەم فەرهەنگە ملکی هەموو
کتێبخانەکانی کوردستان بێت و ببێتە سەرچاوەی
بەکارهێنان بۆ هەموان ،
لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێز و سوپاسدا

براتان/ فاضل احمد امین فلاح
٢٠١٤/٧/٧

## به ناوی خوای گەورە

### وتەیەکی پێویست

ئـەمڕۆ جیهـان لەسـەردەمی زانسـت و تـەکنۆلۆجیادا دەژی و ئێمـەی کوردیش هەر دەبێت بەپێی توانستی خۆمان بەشداری بکەین، تـاکو ئێستا ببەستین بە ڕابوردووەوە و لەسەردەمی خۆماندا بژین و سـوود لـە ئـەزموونی ئەوانـەی پـێش خۆمـان وەربگـرین و مەڵبەنـدی لێکۆڵینـەوەی زانسـتیی کـارا دابمەزرێنین و زمـان و واژەی تایبـەتی زانسـتی بـەکاربهێنین بـۆ ڕاپەڕانـدن و ڕاییکردنی ڕاستییە زانستییەکان، چونکە زانست لە نەتەوەیەکدا نـاژی، تـاکو بە زمانی خۆی کاری پـێ نـەکات و بـە ڕێگـەی خـۆی دەری نـەبڕێت، دەشـێ زانستە زاراوە، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێك و تەنانەت لە کەسێکەوە بۆ کەسـێکی تر جیاواز بێت، بۆیە پێویستە زمانەوان و تۆژیارە خەمخۆرەکانی نەتەوە یەك بگرن و زمانی زانستیمان یەك بخەن.

ئێستایش، کە خەریکە وڵاتەکەمان ببێتە نەوتە وڵات، دەبێت خۆمـانی بـۆ ئامـادە بکـەین و وەك هـەموو نەتەوەیـەکی تـری هاوسـێ و نزیـك و دوورەکـانیش، کـادیری شاییسـتە و تایبەتمەنـدی هـەموو بوارەکـانی بـۆ پـێ بگەیێنین و نەوتە زاراوەی پێویسـتی بـۆ سـازبکەین و بـە پێـودانگی هـەوڵ و کۆششی زانا و شـارەزایانی ئـەوان، ئێمـەش هـەوڵ بـدەین کەرەسـەی نەوتـە زمانی خۆماڵییان بۆ دەستەبەر بکەین، بۆیە بەو گیانەو بەو سۆزو تاسـەیەوە ویستم ئەم زاراوانە، وەك پێشـەکی و بـەرکوڵی فەرهـەنگێکی پـەنجا شەسـت هەزار زاراوەیی پێترۆڵ، بخەمە بەرچاوی پسپۆڕو دڵسۆزو زاناکانی کـورد لـەو بـوارە گرنگـەدا، بـەو هیوایـەی ئـەوانیش بـیر لـە پێکهێنـانی کۆڕۆچکەیەکی زانسـتی بکەنـەوە، یـان هـەر هـیچ نـەبی لـەناو خۆیانـدا، بەچـاوێکی وردو زانستیانە بەم زاراوانەدا بچنەوە و تەتەڵەو تاوتوێیـان بکـەن و کارێـك بکـەن ئێمـەش وەك هـەموو نەتـەوەکانی تـری ئـەم دنیایـە، زانسـتە زمـانی خۆمـان

هەبێت لە هەموو بوارەکانی زانست و تەکنۆلۆجیادا گوێ نەدەینە ماندووبوون و بنەمای ئەو کارە پیرۆزە نەتەوەیی و نیشتمانی و مرۆڤایەتییە دابمەزرێنین، دڵنیابین کە نەخۆمان هیچمان لە خەڵکی کەمترە و نەزمانەکەیشمان، ئەگەر دڵسۆزانە پەروەردەی بکەین و سازی بکەین بۆ زانست پێ نووسین و مشت وماڵی بکەین و کاری پی بکەین.

بێگومان، لە ئەزموونی گەلانی دەر و دراوسێوە دەبێ فێری ئەم ئامۆژگارییانە ببین کە پێویستە بە وردی و ئەوەندەی لەگەڵ تایبەتمەندێتی و بارودۆخی زمانەکەمان دەگونجێت سوودیان لێ وەربگرین و پێڕەوییان بکەین:

(١) کوردی، کە زمانێکی وەرگرتەییە، بە دڵنیایی دەتوانین پێویستییە زانستییەکانمانی پێ ڕایی بکەین، هەرچەندێك زۆرو فرە بابەت بێت و بواری کوردانـدنیش دەدات، ئەمەیش وەڵامی ئەوانەیە کە دەیانووت کوردی زمانێکی نەزۆك و مردووە و زانستی پێ نانووسرێت.

(٢) بەهای زاراوەی زانستی، لەبەرکارهێنان و لەسەر ڕێککەوتنیایەتی ئەگینا سامانێکی پەککەوتەو لەکارکەوتە دەبوو، یان دەبووە هۆی ئاژاوەو لەگەڵ سروشتی زماندا نەدەگونجا، بۆیە دەبێ کاتێك پشت بەو زاراوانە ببەستین، کە مامۆستایان و پسپۆڕان بە کاریان دەهێنن و بە سنگێکی فراوانەوە ئەو واژەو گوزارشتانە بەکاربهێنین کە لەزمانەکەماندا چەسپیون و داوای یەکخستن و ئەو بەکارهێنان و بڵاوبوونەوەیەیان بکەین لە سەراپای کوردستاندا.

(٣) با بۆ هەر واتایەك واژەیەك بەکاربهێنین و با ئەو واژەیە ڕوون و ورد بێت و دەقی واتاکەی ببەخشێت و بۆ لێوەرگرتن و درانە پاڵ گونجاو بێت و نابێت زاراوەی بیانی بە ڕستە، یان دوو واژەی هاوواتا وەربگێڕدرێت و دەبێ ئەوە بزانین کە واژەی بیانی خۆی پیرۆزنییەو ڕەنگە زاراوەیەکی کوردی، وردترو لەڕێنوێنیدا دەربڕترببێت لەو واژە بیانییەی پێشتر بۆی دانراوە.

(٤) کورداندن، هەرچەندە پێویست بێت خراپ نییە، و ناوی کەس و ناوی ڕەگەز وەك ئۆکسجین و هایدرۆجین و ئەنزایم و ئایۆن، یان ئەو واژانەی، کە نیشانەی پۆلێنی گشتین، وەك ڕەگەز، یان جۆرەکانی ڕووەك و گیانەوەر، یان زنجیرە ماددەیەکی چونیەك و لە کورداندندا، پێویستە تا بتوانرێت بنەڕەتەکەی بپارێزرێت و نزیکترین گۆکردن لە بنەڕەتەکەوە بەکاربێت بۆ گوێدانە بنەڕەتی فرەنسایی، یان ئینگلیزی.

تێبینی: ئەم زاراوانە، پێشەکیی فەرهەنگێکی شەست هەزار زاراوەیی پێترۆڵە، هیوادارم بتوانم لە ئایندەیەکی نزیکدا، وەك دیارییەکی شنگ و هەڵە کۆکانە پێشکەشی کتێبخانە خنجیلەکەی کوردی بکەم.

**سلێمانی**

١٢ / ١٢ / ٢٠١١

# هەندێ زاراوەی جیۆلۆجیای نەوت

## (A)

API gravity **١- كثافة** ( م.ب.أ )

**چڕی** ( ف.ن.أ )

**ڕێگەی پێوانەیی فێرگەی نەوتی ئەمەریکاییی دیاریکردنی نەوتی خاو، چڕی بە پلەی (أ.ب.ی) دەکاتە (١٤١,٥/ب – ١٣١,٥)، کاتێك (ب) چڕیی جۆرەکیی پێترۆڵە لە پلەی ٦٠ی فەهرانهایتدا، دەبینرێت ئەمە یەکێکە لە پێوانەکانی بۆمیێ (Baumescale) بۆ بەراورد کردنی شلە سوکەکان بە ئاو.**

abandoned well **٢- بئر مهجور**

**کوێرە بیر**

**ئەو بیرەیە، کە ئەو مەبەستەی بیرەکەی لە پێناودا هەڵکەندراوە، تەواوبووە و فەرامۆش کراوە.**

abyssal environment **٣- البيئة السحيقة**

**ژینگەی زۆر قووڵ**

**ئەو کۆمەڵە بارودۆخ و هۆکارە سروشتی و کیمیاییانەیە کە لە قووڵایی دەریادا باوە، لە قووڵایی دوو هەزار پێ زۆرتردا، وەك ڕووناکی و گەرمی و پەستان و زیندەوەرو جووڵەو خوێ و گازە تواوەکان و هی تریش.**

acceleration **٤- تسارع**

**تاودان**

**زۆربوونی خێرایی بە سەنتیمەتر/ چرکە/چرکەی، بۆ تەنە زەمینییەکان و بە مەتر/ چرکە/ چرکە، بۆ تەنە ئاسمانییەکان**

accretion ٥- إزدياد

زۆربوون

(أ) خستنەسەرێکی بەردەوامی زەویی نوێیە، بۆ زەویی کۆن، بە نیشاندانی ئەو ماددانەی ئاوی ئاوەڕۆ یان ڕووبارێك هەڵیان گرتوون.

(ب) ئەو کردەیەیە، کە تەنە نائەندامییەکانی پێ گەشە دەکات، بە خستنەسەری بەشی نوێ لە دەرەوە.

acicular ٦- إبري

دەرزییەکی

وەسفێکی ئەو کانانەیە، کە بلوورەکانی لە دەرزی دەچن.

acidization ٧- إحماض

ترشاندن

کردەی چارەکاریی بەردە قسڵ، یان دۆلۆمیت، یان بەردە لمینە بەترش، بۆ نەهێشتنی بە شێکی پێکهێنەکانی بەردەکە، هەروەها، بۆ لابردنی ئەو قوڕە کەدراوە لە بیرەکە، لەکاتی هەڵکەندنی بیرەکەدا.

acidzation of well ٨- إحماض البئر

بیر ترشاندن

ترش کردنە ناو بیرێکەوە، بۆ لێکهەڵوەشاندنی ماددە کلسییە ( قسڵەمەنییە) کان.

advance fold ٩- طيّة زاخفة

لۆچێکی خزاو

advance wave ١٠- موجة الزحف

شە پۆلی خزان

لۆچێکی بە زۆری ژوورووە، لەبەردەکانی بنکی ئۆقیانووسەکاندا دەردەکەوێت، لە نزیك کەنارەوە، کە لەگەڵ ئەو پەستانەی لە یەکبینە بە هێواشی خزانی (کیشوەرە بارستەکەی) دراوسێیەوە پەیدا دەبێت بە هەمان ئاراستە، و وردە

وردە لە ڕووی ئاوەکەوە دەردەکەوێت و زنجیرە دوورگەیەکی تەریبی کەنارەکە پێك دێنێت، وەك لە دوورگەکانی ژاپۆندا بەرچاو دەکەوێت.

**١١- التصوير الجوّي** aerial photography

**ئاسمانە وێنە**

وێنە گرتنی ڕووی زەوییە لە فڕۆکەوە و لە بەرزاییەکی دیاریکراو و ئاراستەیەکی تایبەتەوە و بۆ کێشانی نەخشە زەویزانییەکان بەکاردێت.

**١٢- نسيج ( حُبيبي ) عديم الأوجه** allotriomorphic ( granular ) texture = xenomorphic (granular ) texture = anhedral ( granular ) texture

**پێکهاتەی ( دەنکۆڵەیی ) بێڕوو**

زاراوێکە، بەو کانانەی ئاگرەکە ڤرانە دەوترێ کە ڕووی بلوورە تایبەتییەکانیان، دیارییان ناکەن، بەڵام کانە دراوسێیەکانیان شێوەی دەرەکییان دیاری دەکەن.

**١٣- رواسب طميية** alluvial deposits (Alluvium deposits)

**نیشتەلیتەییەکان**

نیشتەی خۆڵ و لم و بەردو ماددەی تری ڕووبارە نوێیەکانە کە گوێزراونەتەوە بۆ دووری سەرچاوەکانیان بە هۆی ئاوی ڕووبارو لافاو و شتی ترەوە ئەو نیشتانەیان تێدایە کە لە بنکی ڕووبارو گۆم و دەریاچەکاندا هەن لە دامێنی شاخەکان و ڕێژگەی ئەو ڕووبارانەدا و ئەگەر ئەو نیشتانە ڕەق بوون پێیان دەڵێن (نیشتە لیتەییە کۆنەکان).

**١٤- طي ألبي** Alpino type folding

**قەدی ئەلپی ( لۆچی ئەلپی )**

ئەو بنچینە لۆچە ( قەدە) گەورانەیە، کە کاردەکەنە نیشتە بنچینەییەکان لە چاڵە ناوچەییەکاندا، وەك پێکهاتە دروستکارەکانی چیای ئەلپ.

angular aggregates
**١٥- تجمعات مُزوّاة**

**تۆپەڵبووە گۆشەییەکان**

**تێکەڵـە پارچـە کـەڤری نـاڕێکی لەسـەر یـەکتر کەڵەکـەبوون، کـە دەتوانرێـت بـە ڕێگای میکانیکی لێك جیابکرێنەوە.**

Angularity,grain
**١٦- التزوي الحبيبي**

**دەنکۆڵە گۆشەدارێتی**

**بارێکی خولانەوەیە، کە کەنارو سووچی دەنکۆڵەکانی گۆشەیین.**

anhedral ( granular) texture
**١٧- نسيج ( حُبيبي ) عديم الأوجه**

**پێکهاتەیەکی ( دەنکۆڵەیی ) بێڕوو**

anhydrite
**١٨- أنهيدرات**

**ئەنهایدرایت**

**کانێکـە، شـێوگی پێکهاتنەکـەی، گـۆگرداتی کالیسـیۆمی** ($CaSO_4$ .$\frac{1}{2}H_2O$) **،بلورێن لەبزینەیی، بە زۆری شێوە تۆپەڵە، لە چینە هەڵمندەکاندا هەیە.**

Anticlinal bend
**١٩- ثنية تحَدبية**

**لۆچێکی قۆقز، لۆچێکی گومەزی**

**لۆچـێکی قـۆقزە لـە کـەڤردا، کـە بـاڵێکی قۆقزەییەکـە، سـووکە لارییـەکی بـەرەو لووتکـەی لۆچـەکە تێدایـە و باڵەکـەی تـری بـە گۆشـەیەکی گـەورەتر لـە لووتکـە دوور دەکەوێتەوە.**

Anticline
**٢٠- الحنيرة = طيّة محدّبة**

**لۆچی قۆقز**

**لۆچێکی نووکدارە، کە باڵەکانی، بەرەو خواردەبنەوە، لێك دووردەکەونەوە.**

anticlinorium
**٢١- حنيرة مركبة**

**لۆچێکی قۆقزی ئاوێتە**

**لۆچێکی قۆقزی گەورەیـە، لـە ژمارەیـەکی زۆر وردە لۆچـی قـۆقزو چاڵ (قوپـاو) پێکدێت.**

۲۲- صدوع مضادة Antithetic faults

دژە درزەکان

کۆمەڵـە درزێکـی نزیکـە پێـك تـەریبن، هـەموو لارییـەکانیان بـەرەو پێچـەوانەی ئاراستەی لاریی چینەکانیانن و دابەزینەکانیان، ڕوودەکەنە درزێکی گەورە کە دەکەونە لای کۆمەڵە دژە درزەکانەوە.

۲۳- قمّة الطيّة apex of fold

لووتکەی لۆچ ( قەد )

هێڵی یەکتربڕینی تەوەرە ئاستی لۆچەکەیە، لەگەڵ هەر ئاستێکی ئاسۆیی کە پێیدا تێ بپەڕێت، دەشێت ئەو ئاستە لەسەر، یان لە ژێر ڕووی زەوی بێت.

۲٤- نسج دقيق aphanitic texture

وردە پێکهاتە

وەسفێکی کەڤرە، ئەگەر ئەو بلورورانەی کە لێیان پێك دێت ئەوەنـدە وردبن، کە بەچاو نەبینرێن و دووجۆرن:

(أ) پێکهاتەی بلوور ورد: microcrystalline texture

(ب) پێکهاتەی بلوور نادیار ( نادیدە): cryptocrystalline texture

۲٥- انزياح ظاهري apparent displacement

دیارەلادان

ئەو ماوە ئاسۆییەیە، کە چینێك لە پنتی درز بردنەکەوە دەخزێت.

۲٦- مكمن ماء جوفي aquifer = ground water reservoir

حەشارگەی ناخاو، عەماراوی ژێر زەوی

کـەڤرە پێکهاتـە، یـان کۆمـەڵێکی، یـان بـە شـێکێتی، لـە ژێـر ڕووی زەویـدا، کـە ئاوێکی پەسندی دەرهێنانی تێدابێت.

٢٧- العضـو ( د ) مـن النطـاق العربـي ( في العربيـة السعودية ) — Arab D- member ( in Saudi Arabia )

**ئەندامی ( د ) ی ناوچەی عەرەبی ( لە سعودییە )**

یەكێكە لەو ئەندامە كەڤرییانەی ناوچەی عەرەبی كە نەوتی تێدایە لە سعودییە.

٢٨- النطاق العربي ( في السعودية ) — Arab Zone ( in Saudi Arabia)

**ناوچەی عەرەبی ( لە سعودییە )**

ناوچـەیەكە لـە كـەڤرەكانی سـەردەمی جـوراویی ژووررووی سـعودییە كـە نـەوتی تێدایە.

٢٩- الدرع العربي — Arabia shield

**قەڵغانی عەرەبی**

ئەو بنكە كەڤرانەیە، كە بنچینەی ئیشتە ئاگرە كەڤرەگۆڕاوەكانی عەرەبستانیان پێك هێناوە.

٣٠- الأقواس الآسيوية السورية — arcs, Asiatic, Syrian

**كەوانە ئاسیاییە سورياییەكان**

ئەو زنجیرە شاخە كەوانەییانەن، لەو لۆچەكەوانەییە ناوچەییانە پێك هاتوون و كە لە خاكی سوریاوە دریژبوو نەتەوە تا خاكی میسرو بە فەلەستین و باكووری نیوە دوورگەی سینادا تێ دەپەڕن.

٣١- جزر قوسية — arcs, island

**كەوانە دوورگەكان**

ئـەو كـەنارە دوورگانـەن كـە لـە كەنارەكانـەوە نـزیكن و ڕیزبـوونی گشـتییان كەوانەیـەك پێـك دێنێـت و لـەو جووڵـە لۆچـەكەوانەییانە پەیـدادەبن كـە لۆچـە خزیوەكان پێك دێنن.

**٣٢- عُقد بُنيّة إنسيابية** arch of flow structure

**گریٰ بۆره ڕەویوەکان**

**ئـەو گرێیانــەن، کــە بەشــێوەی کەوانــەی پانــە تــەریب لەســەر ڕووی ئــاگرە پێکداچــوونەکان دەردەکــەون بــەرەو تەنیشــتە قــۆقزە دوورترەکــانی ئــاگرە پێکداچوونەکان.**

**٣٣- الطيّات الخطّية المقوّسة** arcuate linear folds

**هێڵە لۆچەکەوانەییەکان** **بڕوانە :** linear folds

**٣٤- طيّات مقوّسة** arcuate folds

**کەوانە لۆچەکان**

**ئەو هەرێمە ( ناوچە) لۆچانەن، کە شێوە گشتییەکەیان کەوانەییە.**

**٣٥- نطاق الانسياب** asthenosphere (tectosphere , zone of flowage)

**ناوچەی ( پشتێنەی ) ڕەوین**

**ئەو بەشەیە ، کە لە دوای توێکڵی زەوی دێت و دەشیٰ قووڵیی ناوچەکە ٣٠٠) (٥٠- کیلۆمەتر بێت و کەڤرەکانی کە تێیدایە نیمچە تواوەن، لە بارێکدا کە بەجووڵەکانی لۆچبوون و شێواندن زووکاریان تیٰ دەکرێت.**

**٣٦- ذاتي الأوجه** automorphic = idiomorphic = euhedrAL

**خۆ ڕووەکی، شێوەتەواو**

**زاراوێکـە، بـەو کانانـە دەوتـریٰ کـە لـە ئـاگرە کەڤرەکانـدان و بـە ڕووی بلـوورە تایبەتییەکانیاندا دیاری دەکرێن.**

**٣٧- الخط المحوري للطيّة** axial line of fold

**تەوەرە هێڵی لۆچ**

**هێڵی یەکتربڕینی ئاستی تەوەرەیی لۆچەکەیە لەگەڵ ڕووی زەویدا .**

**٣٨- السطح المحوري للطية** axial plane of fold

**تەوەرە ئاستی قەد ( لۆچ )**

ئەو ڕووەیە کە دەشێ بهێنرێتە بەرچاو لە ناو لۆچەکەدا، بە جۆرێك هەر پنتێك لەسەر ئەو ڕووە،دوو دووریی یەکسانی هەیە لە دوو باڵی لۆچەکەوە، هەروەك بە چینێکی دیاریکراوتێیدا دیاری دەکرێن.

**٣٩- محور الطيّة** axis of fold

**تەوەرەی قەد( لۆچ )**

ئەو هێڵەیە کە کاریگەریی ئاستی تەوەرەیی لۆچەکە پیشان دەدات، وەك لەپانە بڕگەیەکیدا دەردەکەوێت و ئاراستەی گشتیی لۆچەکە دیاری دەکات.

# (B)

٤٠- **حوض مُحتجز** barred basin

**مۆژی بەربەستکراو**

**ئەو مۆژی نیشاندەیە جیادەکاتەوە و بە بەردەمیا درێژبۆتەوە، کە بەربەستێکی زەمینی وەك دوورگە، یان زنجیرە دوورگەیەك لە ئۆقیانووس نیشتەنی کە ئاو تێیدا کەم دەجووڵێت و بەو پێیەیش ئەو ئۆکسجینەی کە تێدایەتی و هەروەها پێوەندیی زیندەییشی تێدا کەم دەکات، وەك دەریای ژاپۆن.**

٤١- **صخور القاعدة** basement rocks

**بنکە کەڤر ( بەرد )**

**ئەو ئاگرە کەڤرە بلووریوە کۆن و گۆڕدراوانەن کە لە ژێر نیشتەنی کەڤرەکانی ستوونی جیۆلۆجییەوە هەن و بە زۆری لە دوای چەرخی کەمبیرییەوە دێت.**

٤٢- **حوض** Basin

**مۆژ ( حەوز )**

**لۆچێکی قوپاوی بۆ خوارەوە کەوانەییەو پێچەوانەی قۆقزە.**

٤٣- **حوض بُنیوی** basin , structural (structural,basin)

**مۆژی پێکهاتەیی ( پێکهاتە مۆژ)**

**ڕووبەرە ( پارچە ) زەوییەکی چاڵە، کەڤرەکان تێیدا بەرەو پنتێکی ناوەندی (چەقی بنکەکەی) لاردەبنەوە، کە کەڤرەکان تێیدا نیشتوون و ئەوجا چاڵ بوون.**

٤٤- **بُنیة حوضیة** basin , structural(basin structural)

**مۆژە پێکهات**

**پێکهاتە بنیاتێکە، لە شێوەی لۆچێکی بەرەو خواردا، کەلاریی چینەکانی بەرەو ناوەوە ڕێکوپێك دەبن، لە هەموو لایەکەوە و بەرەو پنتێکی ناوەندی ( چەقی بنکەکەی).**

٤٥- **صخر الأديم ( صخر القاعدة أو صخر الأساس )** bed rock

**بنكە کەڤر ( یان بنچینەی کەڤر )**

**کەڤرەی ئەو ناوچەیەیە کە خۆڵەکەی لەسەر بەندە ( ڕاگیربووە) و هێشتا کارتێکەرە سروشتییەکانی کەش، کاریان تێ نەکردووە و دەشێت خۆڵە بەندبووەکە ( ڕاگیربووەکە) ، لەو پەیدابوو بێت، یان لەسەری نیشتبێت، یان لە شوێنی ترەوە هاتبێتە سەری.**

٤٦- **الطباقیة** bedding

**چینکاری ، ڕیزبەندیی چینەکان**

**پەیدابوونی (پێکهاتنی) نیشتە کەڤرەکان، بە چین چین لەسەریەکتر نیشتنیان.**

٤٧- **مستوی الطباقیة** bedding plane

**ئاستی چینکاری**

**ئەو ئاستەی کە چینەکانی لەسەر پەیدادەبن و جیادەبن.**

٤٨- **بیدیللیت** beidellite

**بێدیللایت**

**جۆرێکە لە کانەکانی قوڕ، کانە قوڕینەیەکی کۆمەڵەی (مونتمۆ ریللۆنیت)ە.**

٤٩- **طیّات االثني** bending folds

**قەدە ( لۆچە ) نوشتانەوە**

**ئەو قەدانەیە کە لە هێزەکانی سەرەوە پەستاوتنی فرەتین و فرە شوێنی ڕووتەختەکانی کەڤر پێك دێنن و ئەمجۆرە قەدە، نابێتە هۆی کورتبوونی درێژیی کەرتی لۆچەکە، چونکە لۆچەکە، لە ئەنجامی لە ژێرەوە پاڵپێوەنانی چینەکان، بەرەو کەناری لۆچەکەدا، پەیدادەبێت.**

٥٠- **القاعیّات** benthos

**زیندەوەرە بنەکییەکان**

**ئەو زیندەوەرانەی، لە بنی دەریادا دەژین.**

bentonite
**٥١- بنتونيت**
**بێنتۆنایت**
جـۆره قوڕێكـه، لـه شـيبوونەوەی گڕكانـه خوڵـەمێش، بەتايبـەتی لـه كـانی (مۆنتيمۆريللۆنايت ) ( montimorillonite) و بێديللايت (bedillite) پێك دێت، كه ڕەنگی بەرهەمەكانی نەوتی پێ باش دەكرێت .

biofacies
**٥٢- سحنة أحيائية، سحنة حياتية**
**زيندەديمەن**
ئەو ڕەوشەی كەڤرە، كه پێوەسته به سروشتی ئەو بەردينانەوە كه تێيدان، وەك كەڤری مەرجان و بەردی دەباشير.

Baiofacies maps
**٥٣- خرائط السحنة الأحيائية**
**نەخشەی زيندەديمەنەكان**
ئـــەو نەخشـــە جيۆلۆجييانـــەن كـــە دابەشـــبوونی كـــەڤر لـــە ڕووی زيندەديمەنەكانيانەوە ڕوون دەكاتەوە.

biogeography
**٥٤- جغرافية أحيائية**
**زيندۆجيۆگرافيا**
لقێكی جوگرافيازانييه، تايبەتمەنده به لێكۆڵينەوەی دابەشبوونی زيندەوەرانی سەر ڕووی زەوی و پێوەندييان به يەكترەوە.

bit cuttings
**٥٥- كسارة أداة الحفر**
**ئامێری هەڵكەندشكێن**
شكێنی ئەو لوتكەيەی كەڤرەكان كه چنگی چاڵ هەڵكەنەكە، وردی كردووه.

bitumen
**٥٦- بتيومين - قار**
**بيتيومين – قار**
تێكەڵـه هايـدرۆكاربۆنێكی قورســی ڕەق، يـان نيمچـه ڕەقـی پـڕ كـاربۆن و هايدرۆجينه.

block faulting
**٥٧- التصدع الكتلي**
**تۆپەڵه ( بارسته ) درزبردن**
جـۆره درزبردنێكـه، لەناوچـەيەكيدا كـه گـەلێك درزی تێدايـه ودەگـۆڕدرێن بـۆ تۆپەڵی له چاويەكتردا بەرزو نزم.

boring rod – drilling rod

**٥٨- عمود الحفر**

**ستوونی هەڵکەندن**

**ســتوونێکە، مەکینــە هەڵکەنەکــە دەیســووڕێنێتەوە و بۆرییــەکانی چــنگی هەڵکەندنەکانی پێوە بەستراوە.**

bottom hole pressure

**٥٩- ضغط قاع البئر**

**پەستانی بنکی بیر**

**ئەو پەستانەیە، کە دەکەوێتە سەر بنکی بیرەکە لە کاتی هەڵکەندندا.**

bottom sedimentation

**٦٠- ترسب قاعي**

**بنکەنیشتن**

**کردەی نیشتنی مادده وردبووەکانە، لە بنکی بیرەکەدا.**

bottom - set – beds

**٦١- طبقات القاع**

**چینەکانی بنك**

**ئەو کۆمەڵە چینانەی ئەو پێکهاتە قوڕینانەیە کەلە بنکەکەدا، و دوور لە کەنار کەڵەکە دەبن و لە مادده وردبووە زۆر وردەکان پێك دێت.**

boudinage

**٦٢- بنية حشوّية**

**ناواخنە پێکهاتە**

**پێکهاتەیەکە، لەو کەڤرە سەختانەدا پەیدا دەبێت کە درزی ڕاست و چەپ (یەکتربڕ) و ئاڵوگۆڕ لەگەڵ کەڤری لاواز تر دای تێدایە و لە ڕەوینی ماددەی کەڤرە لاوازەکە پەیدا دەبێت ( وەك گلٚمتك و قوڕ) کە بە پەستاوتن دەڕەوێت و درزی کەڤرە سەختەکان ( وەك بەردە قسڵ یان لمین ) پڕدەکاتەوە.**

brittle deformation= irreversible deformation

**٦٣- تشوُّەهش = تحرُّف لاعکوس**

**شێوانی ناسك = شێوانی ناپێچەوانە ( شکست )**

**ئەو شێوانەیە، کە قۆناغی سێیەمی چەماوەی ئەرك وشێوان پیشانی دەدات و بەشی دووەمی چەمینەوەکە ڕوونی دەکاتەوە، و ئەو شێوانەی لە کەڤرەکەدا پەیدا دەبێت لە سنوورەکانی.**

٦٤- الطيات المنكسرة = الطيات المنعزلة = الطيات القصيرة — Broken folds = isolated folds= brachy folds

لۆچە شكاوەكان = لۆچە دابڕاوەكان = لۆچە كورتەكان

لۆچـی ئـەو كـەڤرە نیشـتەنییانەیە كـە درێـژی و پانییـان لێـك نـزیكن و ڕێـژەی تەوەرەی درێژ بۆ تەوەرەی كورتی لۆچەكان لە نێوان ٢:١:٥:١

٦٥- طي تصدعي — bruchfalting ( fault. Folding )

درزە لۆچ

پێكهاتێكە، لە لۆچی درزنی نزیك سەرەكی ( لەسەرەوە بۆ خوارەوە ) پێك دێت.

٦٦- طيّات الضغط — buckle folds

لۆچەكانی پەستاوتن

ئـەو لۆچـانەن، لـەو پەسـتانە لاوەكییانـە پێـك دێـن كـە دەكەونەسـەر ڕووی كەڤرەكان بە ئاراستەیەكی تەریبی ئاستی ڕووتەختییەكەی و ئەم جۆرە لۆچانە دەبنە هۆی كەمیی درێژیی پانە بڕگەی لۆچەكە.

٦٧- تلال مدفونة — buried hills

گردەنێژراوەكان

بەرزایی كۆنن، كە چەند چینێك نیشتەی نوێیان لەسەر نیشتوون.

٦٨- التضاريس الدفينة — buried topography

هەڵەتە نێژراوەكان

هەڵەتی كۆنی، بە نیشتەی نوێ داپۆشراون.

# (C)

٦٩- المحور جـ ( في علم الصخور التركيبي ) c= axis ( in structural petrology )

تەوەرەی جـ ( لە پێکهاتـە کەڤرزانیـدا )

یان ( لە بەردزانیی پێکهاتەییدا )

ئـەو تـەوەرە سەرچـاوەییەیە،کە سـتوون دەبێـت لەسـەر ئاسـتی جووڵـەو لـە تەوەرەی ستوونیی سەر ڕووی کاغەزی یاری دەچێت لە کۆمەڵێکی خزاویدا.

٧٠- أدوات الكيبل cable tools

کەلوپەلی کێبڵ

کۆمەڵـە کەلوپـەلێکی قورسـە، لەسـەرێکی تـەلێکی پـۆڵا دەبەسـترێن و وەك چەکوش، یان پاچ، یان کوتەك، هەڵکەندندا بەکاردەهێنرێت.

٧١- الحفر بالدق cable- tool drilling

کوتەکـە هەڵکەنـدن، بـە کوتـان هەڵکەنـدن، بـە پیاکێشان هەڵکەندن

بە ڕێکوپێك پیاکێشان و بە بەکارهێنانی ئامێری قورس، بەهەر پێکهاتوویـەکی جیۆلۆدجیدا، دەوترێت.

٧٢- مكنة الحفر بالدق cable- tools drilling machine

ئامێری ( مەکینەی ) کوتەکە هەڵکەندن

مەکینەیەکە، لە سمین ( کونکردن ) بە ڕێکوپێك کوتان ، بە کوتـەکێکی قورس، بەهەرپێکهاتوویەکی جیۆلۆجیدا، دەوترێت.

٧٣- بنية شلالية cascade

سۆلاڤ، تاڤگە

پێکهاتەیەکە، لە کۆمەڵە لۆچێکی ناوەنجی پێك دێت کە لە قسڵە بەردەکاندا پەیـدادەبێت، لـە کاتێکـدا کـە بەسەرنشـێوییەکی (لێژییـەکی) لمینـدا هـەرەس دەهێنێت .

**٧٤- أنابيب تغليف** casing pipes

**ناوپۆشه بۆری ( بۆریی ناوپۆش )**

**بۆریی به زۆری پۆلاً، یان ئاسنه، دیواری ناو کونەکانی پیێ ناوپۆش دەکرێت، لەکاتی (یان له دوای) سمیندا، بۆ پاراستن، یان نەڕووخانی دیوارەکانی بیری نەوت، یان ئاو.**

**٧٥- صخور الوقود العضوية** caustobioliths

**کەڤرەکانی ( بەردەکانی ) سووتەمەنییە ئەندامییەکان**

**کۆمەڵە بەردێکی بنەچە ئەندامین کە زۆربەی جۆرەکانی سووتەمەنیی هەڵکەندنە گرنگەکان دەگرێتەوە، وەك خەڵوزو تلْپەی ڕۆن و نەوت.**

**٧٦- حجر كلسي كهفي** cavernous limestone

**بەردە قسڵی کلۆر، یان ئەشکەوتە بەردە قسڵ**

**بەردە قسڵێکە، کە کەلێن و بۆشایی زۆری وەك ئەشکەوتی تێدا بێت.**

**٧٧- طيّة متعرجة** chevron fold = zigzag fold

**پێچۆکە لۆچ = لۆچی پێچاوپێچ**

**لۆچێکی گۆشە زۆرتیژە لە کەڤرە ڕووکەشییەکاندا، کە بە زۆری دووری کورتە و لە ژمارە (٧) دەچێت.**

**٧٨- صمامات فوهة البئر ( شجرة عيد الميلاد )** Christmas tree

**دەمەوانەکانی دەمی بیر ( درەختی کریسمس )**

**لە بواری نەوتدا، بەو کۆمەڵە دەمەوانانە دەڵێن، کە بیرەنەوت دابین دەکەن.**

**٧٩- قاطعة فتاتية** clastic dyke

**تەڵەزمە بەربەست**

**تەڵەزمە بەربەست، تەنێکی تەڵەزمە چینبڕەکانی پێکهاتەیەکی نیشتەنییە، لە ماددەی نامۆ پێك دێت، کە لە تلێشێکەوە بە نیشتە پێکهاتەکەدا تێ دەپەڕێت لەسەرەوە، یان لە خوارەوە، وەك تەڵەزمی بەردەلمینە دابڕەکان.**

**٨٠- طيّة مغلقة** closed fold

**لۆچێکی داخراو**

**لۆچـێکه، سـەره بەرانبـەرەکانی لـە تینـی پەسـتانی پەسـتێوی سـەری، پێـك گەییشتونەتەوە.**

**٨١- متقارب الفواصل** close – jointed

**جمگەلێك نزیکەکان**

**وەسفی کەڤرێکی فرە جمگەی لێك زۆر نزیکن.**

**٨٢- مُنغلق** closure

**داخراو**

(أ) **قـۆقزە پێکهاتەیـەکی داخـراوە، قەبارەکـەی بـۆ دیـاریکردنی بـڕی هایدرۆکاربۆن گرنگە.**

(ب) **سـەرە مـاوەی نێـوان لوتکـەی قۆقزە پێکهاتەیـەك و نـزمترین ئاسـتە، کـە دەشێت هێڵێکی کەنتور داخراوی لێوە بە دەوردا بکێشرێت.**

(ج) **سەرە ماوەی نێوان بنکێکی نزم و نزمترین پنتی کەنارەکەی.**

(د) **پێوەندیی کەنارەکانی تەنیشتە لۆچ پێیەوە لە درزەهێڵەکاندا.**

**٨٣- بنيات إنهيار** collapse structure

**پێکهاتەی هەرەسهێنان**

**پێکهاتێکە، لە خزان و داتەپینی بەردەکان لەسەر لاپاڵی شاخەکان پەیدادەبێت بـەکاری کێشـی زەوی و لۆچـی بچـووك و تۆپەڵـە بـەرد لەسـەر درزە هێڵـەکان چڕدەبنەوە.**

**٨٤- تراكم تجاري** commercial accumulation

**کەڵەکەبوونی بازرگانی**

**کۆبوونەوەی بڕێك نەوت، یان گازی سروشتی، کە بەشی ئەوە بکات دەرهێنـانی پەسندبێت.**

**٨٥- الطبقات الصاملة (الصلدة)** competent beds

**چینە تواناکان (سەختەکان)**

ئەو چینانەن، کە خێراو بە ئاسانی هۆکارەکانی لۆچبوون کاریان تێ ناکەن، وەك بەردە لمینە و بەردە قسڵ.

**٨٦- جرف صدعي مركب** composite fault scarp

**درزە ڕامالێنی ئاوێتە**

ڕامالێنێکە، بەرزییەکەی بە پێی جیاوازیی جووڵەو درزە جووڵە لە هەمان کاتدا، جیاواز دەبێت.

**٨٧- صدوع متمركزه** concentric faults

**چەقە درزەکان**

ئەو درزانەن، کە ڕیزبوونیان لە سروشتدا چەقێکی نزیکە هاوبەشیان دەبێت.

**٨٨- شقوق متمركزه = كسور متمركزة** concentric fractures

**چەقە تڵیشەکان = چەقە شکاوییەکان**

جۆرە تڵیش، یان شکاوییەکن لەبەرددا، کە نزیکەی لە دەوری پنتێکی ناوەندیی ڕیزدەبن.

**٨٩- بلوتونات متطابقة** concordant plutons

**پلۆتۆنە چونیەکەکان**

پلۆتۆنە بارستەیەکە، تەریب بە چینەکان دەچنە ناو بەردەکۆنەکانەوە، وەك درزە تەریبەکان و لاکۆلیت و فاکۆلیت.

**٩٠- توافق** concoformity

**گونجان، سازان**

بنچینەی یەکبینە نیشتن ئەوەیەکە، زنجیرە چینێکی بەرودوایی (یەك لە دوای یەکی) پێك تەریب، لە نێوان هەردوو کۆمەڵەیەکیاندا، کاتە جیاکەرەوەیەك نییە کە نیشانەی پچڕانێکی کاتەکی بێت، بەم جۆرە چینانە دەڵێن پێکەوە گونجاو،

یـان گونجـۆك (conformable) ، و بـەو بنیاتـە پێکهاتنـەی لێیـان پێـك دێـن، دەڵێن گونجۆکی (conformity) ، و ئەو کۆمەڵە چینانەی لە نیشاندنێکی پچڕ پچڕ پێك دێن و بە شێوەی کۆمەڵەی یەك لە دوای یەك بەڵام جیاواز دەبن کە دابـڕی کـاتی یـەکێکیان لـەوی تـر جیادەکاتـەوە، کـە ماوەکـانی نەنیشـتن دەردەخـەن و ڕەنگـە جووڵـەی زەوی و هۆکارەکـانی داماڵینیـان لەگەڵـدا بێـت و پێیـان دەڵـێن چـینە نەگونجۆکـەکان (uncomformable) و بـەو بنیاتـە پێکهاتنـەی نەگونجۆکـەکانی لێ پێـك دێـت، دەڵـێن نـەگونجۆکی (uncomformity).

**٩١- صدوع جرّ مطابقة** congruous drag folds

**هاوجووتە قەدی خزان**

ئـەو قـەدی خزانەیـە کـە پەیوەندییـەکی ئاشـکرا بـە درزی گـەورەترەوە پیشـان دەدات، وەك:

(أ) تەوەری قەدی خزانی تەریب بە تەوەری خزانی گەورە.

(ب) ئاستی تەوەرەیی قەدی خزانـەکان تـەریب دەبێـت بـە ئاسـتی تـەوەرەیی درزی گەورە.

(ج) نێوانە جووڵەی قەدی خزان ئەوە پیشـان دەدات کە چینە لـە تـەوەرەی چـاڵیی سـەرەکی نزیکترەکـان، بـەرەو ژوور جـووڵاون و بـە گـوێرەی چـینە نزیکترەکانی تەوەرەی قۆقزی.

**٩٢- طيّات مطابقة** congruous folds

**لۆچە چونیەکەکان**

ئـەو لۆچـە نـاوەنجی، یـان لۆچـە خزیوانـەن، کـە ڕوودانیـان بەسـتراوە بـە لۆچـە گەورەکانەوە و لە پلەی لێژی و ئاراستەیاندا لە لۆچە گەورەکان دەچن.

**٩٣- كسور أو عروق مقترنة** conjugate fractures or veins

**شكاوى، يان دەمار پەيوەستەكان**

(أ) دوو كۆمەڵ دەمار، يان جمگەن، كە هەمان هێڵی بەركەوتنيان هەيە، بەڵام دژە ئاراستەن (ئاراستە پێچەوانەن).

(ب) هەردوو كۆمەڵە جمگەی لەسەريەك ستوونن.

**٩٤- نظام فواصل مقترنة** conjugate joint system

**سيستمی جمگە لەسەريەكتر ستوونەكان**

سيستمە جمگەيەكە، كەلە دوو كۆمەڵەی ڕێكخراون و ڕۆڵەتێكی پێكهاتنيان هەيە، يان لە دەوری تەوەرێكی پەستانی پەسندن.

**٩٥- التحرّف المتزامن** contemporaneous deformation

**هاوكاتە شێوان**

( **بڕوانە :** deformation contemporaneous )

**٩٦-التحرّف المستمر** continuous deformation

( **بڕوانە :** deformation continuous )

**٩٧- إلتواء الطبقات** contortion of beds

**لە جێچوون و پێچخواردنی چينەكان**

توند بەسەريەكدا لۆچبوونی چينەكان، بە پێوەرێكی گەورە.

**٩٨- خريطة مناسيب** contour

**نەخشەی ئاستەكان**

ئەو نەخشەيەيە، كە گوزارشت لە ڕووزانی ( تۆپۆگرافيا ) ی ناوچەيەك دەكات، بە كێشانی چەند هێڵێكی داخراو، كە هەريەكەيان هەموو پنتە هاوئاستەكان لە ڕووی دەرياوە پێك دەگەيێنێت.

**٩٩- تقلّص** contraction

**چوونەيەك، كەمكردن**

كەمكردنی قەبارە، يان درێژيیە، وەك كەمكردنی قەبارەی گاز بە ساركردنەوە، يان كەمكردنی درێژيی تووڵێكی كانزايە بە نزمكردنەوەی پلەی گەرمی.

**١٠٠- لُبّ = عينة لُبّية** core = core sample

**كرۆك ( نێرك ) = نموونەی كرۆك**

ئەو بەشە لوولەكییە جیۆلۆجییەیە، كە ڕێكەوتی چنگی هەڵكۆڵینەكە دەكات و لوولەكی(كیفی) كرۆك كۆی دەكاتەوە.

**١٠١- اسطوانة اللب** core barrel

**كیفی ( لوولەكی ) كرۆك**

كیفێكی لوولەكییە، لە نێوان چەقۆی هەڵكۆڵین و بۆرییەكانی هەڵكۆڵیندا دادەنرێت و بۆ كۆكردنەوەی كرۆكە نموونەی پێكهێنە جیۆلۆجییەكانی هەڵكۆڵین بەكاردەهێنرێت.

**١٠٢- حصيلة اللب** core recovery

**دەستكەوتی كرۆك**

ڕێژەی درێژیی ئەو نێركەیە كە لەكاتی هەڵكۆڵیندا دەست دەكەوێت، بۆ درێژیی ئەو هەڵكۆڵینەی كە لە پێكهاتە جیۆلۆجییەكەدا كراوە .

**١٠٣- عينات لبّية** core samples

**كرۆكە نموونەكان**

ئەو نموونە بەردە لوولەكییانەن، كە چنگی هەڵكۆڵەكە دەیبڕێت و لە كیفی (بەرگی) نێركدا كۆدەبێتەوە لەكاتی خولە هەڵكەندندا.

**١٠٤- لقمه اللب** coring bit

**قەپی ( پاروی ) كرۆك**

چنگێكی هەڵكەندنی لوولەكیی بۆشی زۆر سەختە، لە پۆڵای بە ئەڵماس، یان كاربۆراندۆم متوربەركراوە.

**١٠٥- عامل التصحيح** correction factor

**هۆكاری ڕاستكردنەوە**

ڕەنووس، یان هاوكێشەیەكە، پێویستە بخرێتە سەر ئەو بەهایەی لە كردەیەكدا دۆزراوەتەوە، بۆ ڕاستكردنەوەی هەڵەی ئەزموونی.

١٠٦- ربط المتكونات correction of formation

**پێکەوە بەستنی پەیدابووەکان**

دۆزینـەوەی کاتـە پەیوەنـدیی نێـوان پەیـدابووە جیۆلۆجییـە هەمـەجۆرەکان و کاتەکی ڕیزکردنیانە.

١٠٧- تغضُّن الطبقات corrugation of beds

**لۆچبوونی چینەکان**

تونـد نوشـتاندنەوەی چـینەکان و بـە پێوانەیـەکی بچـووک لەسـەریەکتر قەدکردنیانە.

١٠٨- تجاعيد crenulations

**چرچەکان، لۆچەکان ( چرچولۆچی )**

ئەو پێکهاتـە لۆچـانەن، کـە درێـژیی شـەپۆلەکانیان لـە چـەند کیلۆمـەترێك تـێ ناپەڕێت و لە بنچینەدا، لە کەڤرە گۆڕۆکەکاندا هەن.

١٠٩- هامة الطية المحّدبة crest of fold

**لوتکە ( پۆپەی ) لۆچە قۆقزەکە**

ئەو هێڵەیە، کە بەرزترین پنتەکانی ڕووی سەرەوەی لۆچ پێکەوە دەبەستێ وەك یەکێك لە چینەکانی دیاری دەکات.

١١٠- طول الهامة crest length

**درێژیی لوتکە**

درێژیی شەپۆلی لۆچی پێکهاتەیە، بە درێژایی لوتکەکەی.

١١١- خطّ الهامة crest line

**لوتکە هێڵ**

ئـەو هێڵەیـە، کـە لـە قـۆقزە پێکهاتـەدا، بـەرزترین پنتـەکان پێـك دەگـەیێنێت لـە خودی چینێکدا، لـە ژمارەیـەکی بێکۆتـایی پانـە بڕگـەی پێکهاتنـدا، و بێگومـان، خودی تەوەری لۆچەکە نییە.

١١٢- **مستوى هامى** crestal plane

**لوتكه ئاست**

ئەو ئاستەیە، کە لەهێنانە بەرچاوی پێوەستیی لوتکەکانی هەموو چینەکان لە پێکهاتەیەکی قۆقزدا پێك دێت.

١١٣- **صدع قاطع** cross fault

**درزی بڕۆك**

درزێکی لێدەرە (کوتکە)، کوتگەی چینەکان بە گۆشەیەك دەبڕێت.

١١٤- **النفط الخام** crude oil

**نەوتی خاو**

ئەو بەردە ڕۆنەیە ( ڕۆنبەردەیە)، کە لە باری سروشتییدا لە زەوی دەردەهێنرێت، پێش چارەسازی کردەنی و شلێکی قیریی فڕۆکە، (فڕندەیە) بنچینەی پێکهاتنی هایدرۆکاربۆنەکانە، لەگەڵ کەمەکێکی ئاوێتەکاتی گۆگرد و نیترۆجین و ئۆکسجین.

١١٥- **الركاز الخام** crude ore

**کانی ( نیشتۆکی ) خاو**

کانە، لەباری سروشتییدا، بەبێ گۆڕین، یان پوختەکردن، یان ئامادەکاری بۆ هەرکردەیەکی تر، وەك نەوتی خاو.

١١٦- **رصيص السحق** crush conglomerate

**تێکەڵە هاڕدراوە**

ئەو چینە توند قەدکردوو درز بردووانەن، کە هەموو ئەو قۆناغانەی تێدا دەردەکەون کە دەتوانرێت لە پشتێنەیەکی بەردەوامی بەردەقسڵەوە بۆ پشتێنەیەکی تێك و تێکشکاوی، وردە پارچەی خڕی وەك تێکەڵەیەکی سفت دەردەکەوێت.

١١٧- **سحق** crushing

**هاڕین**

وردکردنی تەنێك بۆ بەشی وردتر، بە پەستاوتن.

**١١٨- معدن خفي التبلور** cryptocrystalline mineral

**كانێك ( كانزايەك ) بلوورەكانی وردە بلوریون، بەچاونابینرێن .**

**١١٩- أوج، قمة** culmination

**گەییشتنە لوتكە**

(أ) بـەرزترین پنتـی سـەرپۆپەی پێكهاتەیـەكی فڕێـدراو ( nappe) ی پـێ وەسف دەكرێت.

(ب) بەشێكە لە سیستمێكی قەدكردن، بە شـێوەیەكی گشـتی نزیكـە سـتوون لەسەر ئەو لۆچانەی ئاراستەی نقومبوونیان لێوەی دووربێت.

# (D)

١٢٠- **بنيه انفصاليه** decollement

**كووچه جياكارەكان**

**ئاستێكى چينەكانە، كە تەنيا جووڵەى قەدكردن و درزبردنيان بەسەردا هاتووە و پێكهاتنەكانى ژێريان كاريان تێ نەكراوە.**

١٢١- **التحّرق التهشُّمى = التحرّق غير المنعكس** deformation, brittle = Deformation, irreversible

**وردبوونە شێوان = شێوانى نا پێچەوانە**

(**بڕوانە:** brittle deformation)

١٢٢- **التحرّف (التشوه) المتزامن** deformation, contemporaneous

**هاوكاتە شێوان**

**جۆرە شێوانێكە، تووشى كەڤردەبێت و لەكاتى نيشتنيدا ڕوودەدات بەتايبەتى لۆچ بوون و درزبردن**

١٢٣- **التحرّف المستمر** deformation, continuous

**شێوانى بەردەوام ( بەردەوامە شێوان )**

**ئەو شێوانى بەردانەيە، كە لەڕەوين زۆرتر پەيدادەبێت وەك لە وردبوون و تەقينەوە.**

١٢٤- **التحرّف المرن** deformation, elastic

**جيرِە شێوان**

**ئەو شێوانەيە، كە قۆناغى يەكەمى چەماوەى ئەرك و شێوان و بەشە ڕاستەكەى ئەو چەماوەيە پيشانى دەدات كە لە وێنەكەدا ڕوون كراوەتەوە و شوێنەوارى ئەو شێوانە لەبەردەكاندا ون دەبێت و كاتێك قورساييەكەى سەرى لابچێت شێوە ينچينەييەكەى پەيدا دەكاتەوە.**




وێنەیەکە، یاسای (( هۆك )) لەبارەی پەیوەندیی ئەرك و شێوان ڕوون دەکاتەوە

**١٢٥- تحرّف نسيجي** deformation, fabric

**پێکهاتە شێوان ( شێوانی پێکهاتەیی )**

ئاراستەی توخمەکانی ( هێمانەکانی ) پێکهاتەی بەردە، کە بەهۆی پەستانی دەرەکیی سەربەردەکەوە پەیدادەبێت.

**١٢٦- التحرّف اللدن = التحرف المتبقي** deformation plastic

**گونجۆکە شێوان = شێوانی ماوە** =deformation, residual

ئەو شێوانەی قۆناغی دووەمی چەماوەی ئەرك و شێوان گوزارشتی لێ دەکات و بەشی یەکەمی سەرەتای چەمینەوە ڕوونی دەکاتەوە و ئەم شێوانە، هەرچەندە بە نەمانی ئەو قورساییەی خراوەتەوەسەری، ڕاستەوخۆ لا ناچێت، بەلاّم بەردەکە وەك خۆی دەمێنێتەوە و بەرهەڵستیی دارِووخان دەکات لەو قۆناغەدا.

**١٢٧- آبار التحديد** delineation wells

**بیرەکانی سنووردانان**

ئەو بیرانانەن ، کە بۆ دیاریکردنی ناوچەیەك لەناوچە نەوتییەکان هەڵدەکەندرێن.

١٢٨- **برج حفر** (**دريك**) derrick

**کەلوی هەڵکەندنی** ( **دێریك** )

کەلوی لە تۆڕی ئاسن پێکهاتوون، لەو شوێنانەدا دادەچەقێنرێن کە دەویسترێن زەوییەکەی هەڵکەندرێت، بۆ دەرهێنانی نەوت، یان سامانی کانیی تر، بۆ چەسپاندنی ئامێرەکانی هەڵکەندن و ئاسانکردنیان و بەناوی داهێنەکەیەوە (derrick) ناونراوە.

١٢٩- **بئر تطوير** development well

**بیری گەشەکردن**

بیرێکە، بۆ گەشەکردنی نەوتەلأنەکە و گەیاندنیە قۆناغی بەرهەمهێنانی هەڵدەکەندرێت.

١٣٠- **صدع يميني** dextral fault

**ڕاستەدرز**

درزێکە، ئەو بارستەیەی لەلای دووری بینەرەوەیە، وا دیارەکە بەرەو ڕاست بزوێنراوە.

١٣١- **طيّة يمينيّة** dextral fold

**ڕاستە لۆچ**

لۆچێکی ناچونیەکە، لا درێژەکە وادەردەکەوێت کەلا کورتەکە بەرەو ڕاست بزواندوویەتی، کاتێك بینەر بە دریژایی لادرێژەکە دەیپشکنێ.

١٣٢- **صدع مائل** diagonal fault = oblique fault

**لارە درز**

درزێکە بە هەموو بارێکدا درێژدەبێتەوە لە نێوان درێژەی چینەکەو ڕاستەی لارییەکەیدا.

١٣٣- **فواصل مائلة** diagonal joints

**لارە جمگەکان**

ئەو جمگانەن، کە ئاراستەکەیان دەکەوێتە نێوان لاری و لاریی ئەو چینانەی کە تێیاندایە.

diaphragm ١٣٤ - **حجاب**

**پەردە**

جیاکەرەوەی نێوان دوو شتە، کە دەتوانرێت پلەی داپۆشرانی دابین بکرێت.

diaper folds ١٣٥- **طيّات اختراقية**

**لۆچە تێپەرەکان**

ئەو لۆچە قۆقزانەن، کە پێداتێپەڕین ( سمین) ی چینەکانی ئەو بەردانەی لێ پەیدادەبێت کەلەسەرییەوەن و لەو ناسك و توێك هەڵدەرترن.

dichotomic linear ١٣٦- **الطيات الخطية المتفرعة**

**لۆچە هێڵییە پەلهاویشتووەکان**

( **بڕوانە :** linear folds )

digitation ١٣٧- **تصَبُّع**

**پەنجاندن ( بوونە پەنجە )، پەلوپۆهاویشتن**

لۆچی قۆقزی ڕاکشاوی ناوەنجین، لە لۆچێکی سەرەکی ڕاکشاو جیابوونەتەوە و لە پەنجە دەچن .

dip-and fault structure ١٣٨- **بنية ميل وصدع**

**پێکهاتەی لاری و درز**

پێکهاتەیەکە، لە زنجیرەچینێکی بە ئاراستەیەکی دیاریکراودا لارەوەبوو کە درزێکی ئاسایی لار ( درزی ڕاکێشان) بە ئاراستەیەکی پێچەوانە دەیبڕێت، پێك دێت.

dip of fault ( strike dip) ١٣٩- **ميل الصدع**

**درزە لاری**

گۆشەی نێوان ئاستی درزو ئاستی ئاسۆییە.

dip or inclination ١٤٠- **الميل**

**لاری**

ئەو گۆشەیەیە، کە دەکەوێتە نێوان ئاراستەی تینی کایەی موگناتیسی زەوی لە شوێنێکدا وئاستی ئاسۆ لەو شوێنەدا.

١٤١- صدع ميلي dip fault

**لاره درز**

درزێكه، تەریب به ئاراستەی لاری چینه درزبردووەكان، درێژدەبێتەوە.

١٤٢- مُنحَدر الميل dip slope

**لێژیی لاری**

واژەیەكه، به ڕووی زەوی دەڵێن ئەگەر لێژبوو لەگەڵ ئاراستەی لاریی چینەكان.

١٤٣- حفر موجّه = حفر اتجاهي directional drilling

**هەڵكەندنی ئاراستەكراو = ئاراستەی هەڵكەندن**

كردەی سمین، یان هەڵكەندنی بیرێكه، كه پێش سمین و هەڵكەندنی نەخشی دەكێشرێت و لە بنچینەدا، ئەمە بۆ هەڵكەندنی چەند بیر، یان كونێك لە شوێنێكدا بە سوودە

١٤٤- مُتّجه الإنفصام directrix

**ئاراستەی درزبوون**

ئەو ئاراستە گشتییەیه، كه درزبردن و قڵیشانی لە چینە لۆچبووەكاندا پێ ڕوودەدەن.

١٤٥- تخالف disconformity

**نەگونجان**

ئەو بەزرترین پلەی نەگونجانەیە، كه دوو كۆمەڵە پێكەوە نەگونجاوەكە بەردی نیشتەیە (واتە یەك بابەتن) بەڵام ڕووی نەگونجانی نێوانیان، لە شێوەی ڕوویەكی داماڵینی كۆندایە ( كه نیشانەی ماددەیەكی جیاكەرەوەی دووروودرێژە) و بەمجۆرە پێكەوە ڕێكنكەوتنە دەڵێن نەگونجان (disconformity) و بە دوو كۆمەڵەكە دەڵێن نەگونجۆك (disconformable) و دوو جۆرە :

(أ) **تخالف متواز** parallel disconformity

**تەریبە نەگونجان**

(ب)ئەوەیە، کە ڕووی داماڵینەکەی لە نێوان دوو کۆمەڵە چینی پێکتەریبدا لێك جیادەکرێنەوە.

**تخالف زاوي** angular disconformity

**گۆشە نەگونجان**

ئەوەیە، کە ڕووی داماڵینەکەی لە نێوان دوو کۆمەڵە چیندا لێك کراونەتەوە کە کۆنترەکەیان، جووڵەی لۆچبوون و درزبردنی بەسەرداهاتووە و لاریی چینەکانی، لە لاریی چینەکانی سەروخۆی جیاوازە.

**١٤٦- بلوتونات متخالفة** discordant plutons

**پلۆتۆنە پێکەوە نەگونجاوەکان**

بارستەیەکی پلۆتۆنییە،دەترنجێتە نێوان بەردەکۆنەکانەوەو پێکهاتە دروستکارەکانی ئەو بەردانە دەبڕێت، وەك چڵە بڕندەو گەردنەگڕکانییەکان.

**١٤٧- الكشف** discovery

**دۆزینەوە**

یەکەم بەرچاوکەوتنی هەر ماددەیەکی کانزایی نوێ لە شوێنێکی دیاریکراودا.

**١٤٨- بئر الكشف** discovery well

**بیری دۆزینەوە ( بۆ یەکە مجار )**

بیرێکە، کۆبوونەوەی نەوت و گازی تێدا دەسەلمێت، کە پێشتر نەزانراوە و بەرهەم نەهێنراوە.

**١٤٩- طيّ غير متّسق** disharmonic folding = =

**طيّ غير متوافق** = discordant

**لۆچی ناڕێك = لۆچی ڕێکنەکەوتوو**

ئەو لۆچەیە، بە کۆمەڵەی بەرودوا ئاڵۆگۆڕ لە چینە گونجۆك و ناسکەکاندا پەیدا دەبێت و سروشتی لە هەر کۆمەڵەیەکدا، لەگەڵ کۆمەڵەکەی دوای خۆی جیاوازە.

**١٥٠- طيّات لاتناسقية** disharmonic folds

**لۆچە ناڕێکەکان**

**ئەو لۆچانەن، کە شێوەکانیان بەدرێژایی ئەو ستوونە ستراتیگرامییەی تێیدا دروست دەبێت، ئەگەر بەهەڵکەندنیان بەرەوخوار بەدوایاندا بچین، چونیەك نییە.**

**١٥١- ملخ التفصل** disjunctive dislocation

**هەڵکێشانی لێك جیاوەبوو**

**دیمەنی پێکهاتەی دروستکاریی بەردەکانە، بنچینەکەی لێکجیابوونەوەو درزبردنە بە زەمینە جووڵەکان.**

**١٥٢- الإلتواء والتّمدّد** distortion and dilation

**وەرگەڕان و کشان**

**وەرگەران – لە جیۆلۆجیای دروستکاریدا – گۆڕانی شێوەیەکە لە کردەی هەڵچوون پەیدادەبێت، وکشان، گۆڕانی قەبارەیە، کە لە هەمان کردە پەیدادەبێت.**

**١٥٣- عينة الحفيرة** ditch sample

**نموونەی قۆرت**

**ئەو پارچە پێکهاتە جیۆلۆدجییانەن، کە ڕێکەوتیان دەکات و چنگی هەڵکەندنەکە وردیان دەکات و ئەوجا شلی هەڵکەندنەکە هەڵیان دەگرێت بۆ چاڵۆچکەیەك لە دەوری کونەکە، یان لە تەنیشتیەوە.**

**١٥٤- إنحراف** diversion

**لادان**

**گۆڕانی ئاراستە، یان ڕەوت.**

**١٥٥- عَرّاف** diviner

**فالگرەوە**

**بەو کەسە دەڵێن، کە پێشبینی ڕووداوێك، یان بوونی نەوت، یان گاز، یان ئاو، یان خاوی کانزاکان دەکات لە ژێرزەویدا.**

١٥٦- عصا العِرافة divining rad

داری فاڵچێتی

دارێکـه، لـه لقـی دار، یـان شـتێکی وا دەکرێتـەوە و دەڵـێن ڕەوشـی جـادویی هەیەکـه فاڵچـی بـەکاری دەهێنێت، وا چاوەڕوان دەکرێت، کەلەسـەر خـاو، یـان نەوت ئاو بێت بە پێی پسپۆڕیی فاڵچییەکە، لاردەبێتەوە.

١٥٧- القبّة dome

گومەز

لۆچێکی قۆقزی بۆ سەرەوە کەوانەییە، بەو شێوەیەی پێی دەڵێن گومەز.

١٥٨- هبطة الصدع dome- throw of fault

درزداکەوتن

ماوەی بەرەو خواربوونەوەی ( داکەوتنی) کەڤر ( بەرد)، ئەگەر درزی برد، یـان شکا.

١٥٩- الجانب الهابط down- thrown side

لایە داکەوتووەکە

ئەو بەشەی کەڤرە، کە داکەوتوو دەردەکەوێت، بەلایەکی درزەکەدا.

١٦٠- طيّات انزالاقية drag folds

لۆچە داخزیوەکان

وردە لۆچی ناوەنجین، لەو چینەلاوازنەدا پەیدادەبن، کە کەوتوونەتـە نێـوان دوو چینی چەسپیوەوە و بەوەجیادەکرێنـەوە کـە چینەکانی سـەرو، بـەرەو دوور لـە تـەوەری لۆچـەکە چاڵە گەورەکـە دەخزێـت لـە چـاو چینەکانی خـوارودا و بـە پێچەوانەیشەوە.

١٦١- خُرْم ، ثقب الحفر drill hole

سمراو

ئـەو کـونی سمیینەیـە، کـە سمـۆو ئـامێرە بـەرد سمەکـە لەبەردەکـەدا دروسـتی دەکات.

**١٦٢- جدار الخُرم، جدار هوه الحفر** drill hole wall

**ديوارى سمراو**

ئەو ديوارەيە، كە كونەكەو ڕەوتەكەى لەو پێكهاتە جيۆلۆجييانەدا ديارى دەكات كە پێيدا تێ دەپەڕێت.

**١٦٣- تخريم ،حفر** drilling

**سمين**

كونكردنى زەوييەكە، كە بە زۆرى قووڵ و باريك دەبێت.

**١٦٤- أداة التخريم، أداة الحفر** drilling bit

**ئامێرى سمين ( سمۆ )، يان هەڵكەندن**

ئامێرێكى بڕندەى زۆر سەختە، لە كۆتايى بۆريى سمينەكە دەبەسترێت و بەزۆرى لە پۆلا يان پۆلاو ماسى ( ئەڵماسى) دەستكرد، يان كاربۆراندۆم،دروست دەكرێت.

**١٦٥- مكنة التخريم ( الحفر )** drilling machine

**مەكينەى سمين ( هەڵكەندن )**

مەكينەيەكە، بۆ كون دروستكردن، يان سمينى زەوى بەكاردێت.

**١٦٦- أنابيب التخريم** drilling pipes

**بۆرييەكانى سمين ( هەڵكەندن )**

چەند بۆرييەكن، بە زۆرى لە پۆلاى ئەستوورى و درێژى جياواز دروست كراون، سەرى هەريەكە، يان چنگێكى هەڵكەندن و لوولەكێكى كرۆكيان لێ چەسپ كراوە و بۆ قوڵكردنى سمينەكەو گەياندنى جووڵە لە مەكينەى سمينەكەوە بۆ چەقۆى سمين و لوولەكەى و گواستنەوەى شلەى سمينەكە بۆ بنكى سمراوەكە بەكاردێت.

**١٦٧- رصيف التخريم** drilling platform

**سەكۆى سمين**

سەركەوتەيەك، يان سەكۆيەكە، لەكاتى بەردكوتكردن لە ژێر ئاودا بەكاردێت.

**١٦٨- عمودي التخريم = عمود الحفر** drilling rod = boring rod

**ستوونی سمین = ستوونی هەڵکەندن**

(**بڕوانە:** boring rod)

**١٦٩- الاحداثيات الدنيا ميكية لبؤرة الزالزال** dynamic parameters

**سنوور دیاریکەرەی داینەمیکیی** earthquake focus

**ناوەندی بومەلەرزە**

**وێنەیەکە، باری درزی جووڵەو چینەکانی ناخی زەوی و ئاواستەی جووڵەی تۆپەڵە بەردەکانی سەر ڕووی ئەو درزانەی دەبێتە هۆی بوومەلەرزە، دیاری دەکات.**

# (E)

١٧٠- **الطيّات الخطية الدرجيـة** echelon linear folds

**هێڵە لۆچی پێپیلکەیی**

(بڕوانە: linear folds)

١٧١- **انـزلاق** ecoulement

**خزان، خلیسکان**

**خزانـی بارسـتێکی گـەورەی کـەڤر ( بـەرد) ە، لـە ژێرکاریگـەریی لادان یـان لـە ئەنجامی ڕوودانیدا.**

١٧٢- **التحرف المـرن** elastic deformation

**جیڕە لادان (شێواندنی جیڕی)**

(**بڕوانە :** deformation, elastic)

١٧٣- **حَدّ المرونة** elastic limit

**سنووری جیڕی**

**ئـەو سـنوورەیە، کـە ئەگـەر پەسـتان و ئـەرکی خراوەتەسـەر تـەنێك تێپـەڕی کردلێی، دەشێوێت و ئەگەر ئەو پەستانەی لەسەر لابرا، وەك خۆی لێ نایەتەوە.**

١٧٤- **سجل كهربائي** electrical log

**تۆماری کارەبایی**

**هێڵێکـی شـەپۆلدارە، جیاوازیی پلـەکانی بـەرگریی کارەبـایی چـینەکانی بیرێـك دەردەخـات، و ئـەم تۆمارانـە، بۆپێکـەوە بەسـتنی نێـوان بیرەکـان لـەڕووی جیۆلۆجییەوە بەکاردەهێنرێت.**

١٧٥- **الصدوع و الطيّات المتدرّجة** en-echelon, (fault and folds)

**درزو لۆچە پلە پلەکان (تاکولۆیەکان)**

**ئەو کۆمەڵە درز یان وردە لۆچانەن کە ماوەی زۆر درێژ نابنەوە هەندێکیان لە هەندێکی تریان تێ دەپەڕن.**

١٧٦- بنيات تراكيب جّوانيّة enterolithic structure

پێکهاته ناوەکییەکان

پێکهاتەی لێکچوون لە هەندێ بەردا پەیدا دەبن، وەك نیشتە خوێیین و بەردە قسلٚ و دەبێتە هۆی زۆری و کەمیی قەبارەی بەردەکان و لە هەندێ گۆڕانی کیمیایی پەیدا دەبێت کە بەسەریاندا دێت.

١٧٧- ترسُّب قــارّي المنشـأ epirogenic sedimentation

نیشتەی بنەچەکیشوەری

ئــەو نیشــتنانەن، کــە لــە چاڵۆچــۆڵییە هەرێمییەکانــدا ڕوودەدەن، لــەکاتی پەیدابوونــە ســەرەتایی و ناوەندییەکانیانــدا و بەســێ بــاری یــەك لــە دوای یــەك (بەرودوا) جیادەکرێنەوە کە نیشانەی کۆنیی دەریـاو داپۆشـران ( نقومبـوون) و دەرکەوتنیانن.

١٧٨- حركات المناسيب البحرّية eustatic movements

( جووڵەی ) شوێنگۆڕکێی ئاستە دەریاییەکان.

ئەو گۆڕانە گشتگرانەن کە بە سەر ئاستی ڕووی دەریا دێن لە کاتە جیۆلۆجییە جیاوازەکانــدا و لــە بەرزبوونــەوەو نزمبوونــەوەی بنکــی زەریاکــان، یــان پەنگخواردنەوەی ئاو لە کلاوەکانی سەهۆڵ و لێوە دەرهاتنیدا.

١٧٩- المتبخرات،التبخريات ( رواسب التبخير ) evaporites (evaporation sediment)

هەڵمینەمەنی ( نیشتەکانی هەڵماندن )

ئەو نیشتانەن، کە لە ئەنجامی خەستبوونەوەی پاش هەڵمین پەیدادەبن، وەك جیپسۆم ئەنهایدرات و بەردەخوێ.

**١٨٠- إستكشاف** exploration

**دۆزینەوە و کێوماڵکردن ( بەدواداگەران )**

درێــژە تۆژینــەوە، بــەڕێگا جیۆلــۆجی، یــان جیۆفیزیــایی، یــان جیۆکیمیــایی بەمەبەســـتی دیـــاریکردنی بڕوجـــۆری پاشـــەکەوتی خاوەکانزاییـــەکان و هایدرۆکاربۆنەکان جێبەجێ دەکرێت.

**١٨١- بئر الاستکشاف** exploratory well

**بیری دۆزینەوە**

ئـەو بیرەیـە، کـە لەناوچـە نوێیەکانـدا هەڵدەکەنـدرێت بـۆ دۆزینـەوەی نـەوت و دەتوانرێــت زانیــاریی بــەهاداری لــە ڕووی زەویزانــی و کۆکارییــەوە لێ دەســت بکەوێت، بە وەرگرتنی نموونەی زۆری ناخەکی و لێکۆڵینەوەیان.

# (F)

**١٨٢- نسيج الصخر** fabric of rocks

**شێوازی چنینی کانە بەرد**

ئەو شێوازەیە، کە چنینە بەشە بەردپێکهێنەکان بە خۆیانەوە دەیگرن و ئەو جووڵەو گوشارانەی کە دەکەونەسەر بەردەکان و ڕووخساری دەرەکییان دیاری دەکەن.

**١٨٣- سحنة** facies

**دیمەن**

ئەو کۆمەڵە ڕەوشە بەردی و کانزایی و هەڵکەندراوییانەن کە دوو بەردیان پێ لێك جیادەکرێتەوە، کە لە هەمان شوێن و کاتی جیۆلۆجیدا دروست بوون.

**١٨٤- فونة السحنة، سحنة حيوانية** facies, fauna (fauna,facies)

**دیمەنی کۆمەڵە گیانداری ناوچەیەك**

ئەو کۆمەڵە گیاندارانەن، کە خۆیان بۆ ژیان لە ژینگەیەکی نیشتەنی تایبەتدا گونجاندووە، هەرچەندێك کاتی نیشتنەکە جیاواز بێت و بەجۆرێك ئەو ژینگەیە پیشان دەدات، کە لە ژینگەی تر جیای دەکاتەوە.

**١٨٥- فلورة السحنة، سحنة نباتية** flora،facies

**دیمەنی گوڵجاڕ ( کۆمەڵە گوڵی ) ناوچەیەك**

ئەو کۆمەڵە گوڵ و ڕووەکانەن، کە خۆیان بۆ ژیان لە ژینگەیەکی نیشتەنی تایبەتدا گونجاندووە، هەرچەندێك کاتی نیشتنەکەی جیاواز بێت، کەلە ژینگەی تر جیای دەکاتەوە.

**١٨٦- سحنة مستحاثة ( أو أحافير أو متحجرات )** facies, fossil(fossil,facies)

**بەردینە دیمەن ( دیمەنە بەردینە )**

بەردینەی جۆرە زیندەوەرێکە،کە خۆی بۆ ژیان لە ژینگەیەکی تایبەتدا گونجاندووە کە پێی دەناسرێتەوەو تایبەتە بە خۆی و لە هیچی تردا نییە.

**١٨٧- توسمّ الطبقات** facing of strata

**ڕوخساری چینەکان، چینە نیشانەبوون**

هەوڵی دیاریکردنی ڕووە بنەڕەتییەکانی چینەکان، کە زۆر گرنگە لە باری ئەو چینە پێکهاتن ئاڵۆزانەدا کە ڕەنگە ئەو ڕووەیان، بارودۆخێکی نائاسایی وەرگرتبێ.

**١٨٨- تحدّب زائف** false anticline

**گەندە قۆقزی، قۆقزییە درۆیینە**

بنیات پێکهاتەیەکە، لە شێوەی کووڕی، یان قۆقزییەکەیدا، لە ئەنجامی کرژبوون و یەکگرتن و بەردەکان لەسەر تۆپەڵێکی بەرهەڵستی وەك گردێك نێژراو، یان بارستە بەردینەیەك پەیدادەبێت.

**١٨٩- تطبُّق زائف** false bedding

**گەندە چیناندن، چیناندنە درۆیینە**

گۆڕانی ئاراستەی توێژاڵەکانی چینێکەکە، کە لە ئاراستەی گشتیی چینەکان ناچێ وچینی ڕاستەقینە نییە.

**١٩٠- طيّة مروحيّة** fan fold

**لۆچی پەروانەیی ( پەروانە لۆچ )**

لۆچێکی قۆقزییە، هەریەکەی باڵەکانی بە ئاراستەی ئەوی تر لاردەبێتەوە، یان لۆچێکی چاڵەکییە، هەریەکەی باڵەکانی دوور لە ئاراستەی ئەوی تر لاردەبێتەوە.

**١٩١- صدع** fault

**درز**

شکاندنێکە، لە زەویدا، کە لە هەردوولایەوە، بارستە ( گەواڵە) بەردەکان لە ئاستی ئەودا دەجووڵێن و لێك دەترازێن.

**١٩٢- حوض تصّدع** fault basin

**درزە مۆژ ( درزە چاڵ )**

ناوچەیەکی ڕۆچووە کە لە ئەنجامی لێکترازانی چینەکان پێك دێن و لە چاو ناوچەکانی دەروبەریدا و درزەکان لێکیان جیادەکاتەوە.

١٩٣- البريشة الصدعية fault breccia

درزە تەڵەزم

تەڵەزمە بەردی وردی گۆشەدارن، لە درزبردن پەیدابوون و بە ماددەیەکی لکێن پێکەوە لکاون ونیشانەن بۆ هێزو ئاراستەی جووڵانی چینەکانی.

١٩٤- مَصْدَعة، معقدة fault complex

ئاڵۆزە درز

بارێکی ئاڵۆزی کۆمەڵە درزێکی پێکداچوو بەیەکتر بڕی، تەمەنی جیۆلۆجی یەکسان، یان جیاوازن.

١٩٥- عناصر الصدع fault elements

هێمانەکانی درزبردن

ئەو دیاردە سروشتییانەن کە بە دوای درزبرندا دێن.

١٩٦- خطّ الصدع fault line

هێڵی درز ( درزە هێڵ )

یەکتربرینی ئاستی درزبردن و ڕووی زەوییە.

١٩٧- مستوى الصدع fault plane

ئاستی درزبردن

ئەو ئاستەیە، کە بەگۆشەی جیاواز درزبردنی تێدا ڕوودەدات.

١٩٨- متجه الصدع fault strike

ئاراستەی درزبردن

ئەو ئاقارەیە ( ئاراستەیەیە)، کە ڕووی درزبردنەکەو ئاستی ئاسۆیی یەکتری تێدا دەبڕن.

١٩٩- مصيدة صدعية fault trap

درزە داو

داوێکی نەوتە، داخرانی لەبوونی درزێك یان زۆرترەوە پەیدادەبێت.

٢٠٠- تصدُّع = تكسُّر faulting = fracturing

تێكشكانی بەردە، بە هێزی ڕاكێشان، یان پەستێوران.

٢٠١- فواصل ريشية feather joints

پەڕە جمگە

چەند كۆمەڵە جمگەیەكی بچووكن لە تەنیشت درزێكی گەورەوە بەشێوەی پەڕ، لقوپۆپ دەهاون.

٢٠٢- تطَبق مُتفلَق fissile bedding

درزە چیناندن ( چیناندنی درزن )

ئەو چیناندنەیە، لەو توێژاڵانە پەیدا دەبێت كەئەستوورییان لە ٢ مم كەمترە.

٢٠٣- تَفلُق fissility

تـرەكین ( درزبردن )

ڕەوشـی بـە ئاسـانی تـرەكین و درزبردنـی بـەردە، بـە ڕووتـەختی پێكتـەریبی یەككگرتوو.

٢٠٤ – شَقْ fissure

درز، تلیش

ئەو تلیشـە بەردانـەن، كـە دەشـێت فراوان بن، یـان تـەنیا درزێكـی بچووكن و لـە چەند گرێیەك ( ئینجێك) یان چەند پێیەك تێ ناپەڕن.

٢٠٥- طيّ الانثناء = طيّ الانضغاط flexure = folding=

لۆچی نوشتانەوە = لۆچی پەستێوران compression folding

جۆرە لۆچێكە، كە لە پەستێوران پەیدا دەبێت و هێزەكە بە تـەریبی لەگـەڵ ڕووە لۆچبووەكاندا كارەدەكات.

٢٠٦- انزلاق مع الطيّ flexural slip

خزین لەگەڵ لۆچبووندا

جووڵانی (خلیسكانی) بەردە سەختەكان، لۆچبوونی چینەكانی تێدا باوترە لـە خزان لەناو خۆیاندا.

**٢٠٧- طيّة ثني** flexure fold

**لۆچی نوشتانەوە**

**جۆرە لۆچێکە، کە قەبارەیان لە نێوان وردبینی و شاخ دروستکەردایە، و جووڵەی ستوونی لە سەر هێڵی تەوەرەیی و بەلایەکانی تەریب دەجووڵێن، کە کەمییەکی هەستپێکراو لە فراوانبووندا ڕوودەدات.**

**٢٠٨- طيّ الانزلاق** flexure – slip folding

**خزینە لۆچبوون**

**ئەو جوولانەن، کەلەبەردە چین چینەکاندا ڕوودەدەن و چینە سەختەکان دەنوشتێنەوە و ڕووتەختەلاداوی چینە ناسەختەکان دەخزێن.**

**٢٠٩- طيّ الانسياب** flow folding

**ڕەوینە لۆچبوون**

**لۆچبوونێکە، لەوبەردانەدا ڕوودەدات، کە لاوازیی بەرهەڵستیی لە چاو هۆکارەکانی لادانەدا زۆر کەمە، بە جۆرێك ئەو شێوەیە وەردەگرێت کە پەستاوتنی بەردەبەهەڵستەکارەکانی دەورو پشتی دەیخەنە سەری، یان جۆرە پەستاوتنە گشتییەکانی بواری لادان دەیسەپێنن.**

**٢١٠- طيّات الأنسياب** flowage folds

**ڕەوینە لۆچبوونەکان**

(أ)**لۆچە ناوەنجییەکان، کە لە ڕەوینی بەردەکان بەرەو تەوەری پێکهاتەیەکی پەیدادەبێت و ئاراستەکەی بەسەر لۆچە ناوەنجییەکاندا باو دەبێت.**

(ب)**ئەو لۆچانەن، چینەکان لە لووتکە چاڵییەکاندا تەنك و لە بنکەدا ئەستوور دەبن.**

**٢١١- طيّة** fold

**لۆچ**

**نوشتانەوەی چینە بەردەکانە، بۆ سەرەوە، یان خوارەوە، بە هۆی ئەو پەستانەوە کە لە جووڵە زەمینییەکانەوە ڕوودەدات.**

٢١٢- محور الطيّة fold axis

تەوەری لۆچ

هێڵێکی ئەندێشەییە، دوو باڵی لۆچەکە لەسەری ڕووبەڕوو ( بەرانبەر) دەبن.

٢١٣- صدع طيّ fold – fault

لۆچە درز

لۆچێکی بەهۆی درزەوە دروست بووە، لەو هۆ، یان هۆکارە پەیدا دەبێت کە لۆچەکەی لە پێناودا ڕوودەدات.

٢١٤- طرف الطيّة fold limb

لۆچە سەر، سەری لۆچ ( پەلی لۆچ )

ئەو لایەی نوشتانەوەیە، کە پێی تەواودەبێت و نوشتانەوە، دوو سەری (پەلی) هەیە.

٢١٥- مستوى الطيّة fold plane

ڕووتەختی تەوەری لۆچ ( قەد )

ڕووتەختێکە، بە تەوەری نوشتانەوەکەدا تێپەڕدەبێت دوو سەرەکەی (پەلەکەی) بە هەردوولایدا لاردەبنەوە.

٢١٦- نظام طيّ fold system

سیستمی لۆچ ( قەد )

کۆمەڵە قەد ( لۆچ) ێکە، ڕەوش و ئاقاری هاوبەشیان هەیەو باوەڕوایە کە یەك بنەڕەتیان هەبێت.

٢١٧- الطيّ folding = placation

قەد ( لۆچ ) بوون

گرژبوونێکە، لە توێکڵی زەویدا، لە ئەنجامی زەمینە جووڵەکاندا، کە دەبێتە هۆی لۆچ و چەمینەوەو قەدبوونی بەردەکان.

٢١٨- طيّات المرتبة الأولى= تحدّبات و تقعرات مركبة folds of the ١st order

لۆچە پلە یەکەکان synclinoria=anticlinoria

ئەو لۆچە درێژانەن،کە لە چەند لۆچێکی سادە پێك دێن.

٢١٩- طيَات المرتبة الثانية — fold of the ٢nd order

لۆچە پلە دووەکان

لۆچە درێژی مامناوەند، یان کورتەکانن، دەکەونە سەر لۆچە پلە یەکەکان.

٢٢٠- جدار سفلي — foot wall

دیواری خوارو

بەو چینە بەردانە دەڵێن، کە لەسەرووی درزەکانەوە دەخلیسکێنە خوارەوەی ڕووی درزەکە.

٢٢١- جدار سفلي للصدع — foot wall of a fault

دیواری خواروی درز

ئەودیوارەیە، کە لە کۆتایی بەردەکانی لای خوارو لە ئاستی درزدا پێك دێت.

٢٢٢- صخور الجدار السلفي — foot wall rocks

بەردەکانی دیواری خوارو

ئەو بارستە بەردانەن، کە لەلای خوارووی ڕووی درزەوەن.

٢٢٣- طرف أمامي — fore limb

سەری پێشەوە

لا زۆرلارەکەی (لێژەکەی) کووڕییەکی ناوچونیەکە و لە تەنیشتە پاڵپێوەنەرەکە، پێك دێت.

٢٢٤- أرض المقدّمة = مقدّمة اليابسة — foreland

پێشە زەوی = پێشی وشکانی

پارچە ئەرزە لە چاوخۆدا جێگیرەکەی کیشوەرەکەی تەنیشت زەریایە، کە بەرەو ئەو دەجووڵێت و نیشتە چاڵییە هەرێمییەکان لەکاتی جووڵەکانی بنیاتنانی شاخەکاندا، دەیپەستێون.

٢٢٥- تكوين — formation

پێکهاتن، پەیدابوون

بەشی بنچینەیی پۆلێنی خۆماڵیی بەردەکان کە سنوورێك دەوری داوە و

دەتوانرێــت لــە دەشــتدا چــاودێری بکرێــت و بــە ڕەوشــی بــەردیی تایبــەت جیابکرێتــەوە بێئــەوەی گویٚ بدرێتــە ئــەو مــاوە جیۆلۆجییــەی تێیــدا پــەیدابووە، وەك پەیدابوونی قوڕی ئەسنا:

(Esna shale formation)

**٢٢٦- هزمة** fossa

**چاڵ**

نزماییــەکی کــەمی پــانی ئاوداپۆشــیوە،دەوری بارســتە کیشــوەرییەکانی داوە، پارچە مادده وردەکانی تێدا کۆدەبێتەوە کە لـەو بارسـتە کیشـوەرییانەوە دێن و بــەردەوامیی ئــەم کردەیــە بــە درێــژایی چــاخە جیۆلۆجییــەکان، دەبێتــە هــۆی بــەردەوامیی داکــەوتنی بنکــی چــاڵەکەی، تــا دەبێتــە سەرچــاوەی لاوازی لــەو شـــوێنەی تـــوێکڵی زەوی کـــە ڕەنگـــە ببێتـــە هـــۆی درزبردنـــی خـــودی بارستەکیشوەرییەکە.

**٢٢٧- کسر** fracture

**شکان**

درزبردنی بەردەکانە، لە ئەنجامی توند قەدبوون، یان درزبردندا.

**٢٢٨- مسامیة تشققیة** fracture porosity

**درزە کونیلەداری**

کونیلـەداریی بـەردە، لـە بـوونی ئـەو بۆشـاییانەی لـە تێکشـکان و وردبـوون بـە تەقینەجیابوونەوە پەیدادەبێت.

**٢٢٩- غاز حُرّ** free gas

**گازی ئازاد**

گــازێکی یەکنــەگرتووە لەگــەڵ توخمــەکانی تــردا، یــان گــازێکی بــە تــەنیا بەرزەوەبووە ، بەبیٚ گەرمکردن.

# (G)

۲۳۰- فاصل ( في التصدع ) gap ( in faulting)

كەلێن ( لە درز بردندا )

تانە جیابوونەوەی چینەکانە لە ئەنجانی درزبرندا و دەتوانرێت بە تەریبی پێداکەوتەی درزبردنەکە بپێورێت.

۲۳۱- قلنسوة الغاز gas cap

کلاّوی گاز

گازێکی بەرەلاّیە، بەسەر ڕۆنەوە لە کۆگەی سروشتیدا و هەرچەندێك بڕی زۆرتر بێت، لەوەی کە دەشێت لە ڕۆنەکەی ژێریدا بتوێتەوە لە ژێر پەستان و پلەیەکی گەرمیی دیایکراودا، ئەو گازە بەرەلاّیە دەبێت.

۲۳۲- حقل الغاز gas field

کانە گاز،گازەلاّن

ناوچە زەوییەکە، گازی سروشتی لێ دەردەهێنرێت.

۲۳۳- نسبة الغاز في النفط gas oil ratio

ڕێژەی گاز لە نەوتدا

ژمارەی ئەو پێ سێجا گازەیە، کە لەگەلّ هەر بەرمیلە نەوتێك دەردەهێندرێت.

۲۳٤- السطح بين الغاز والزيت gas oil surface

ڕووی نێوان گازو ڕۆنە

ئەو ڕووەیە کە خاوی نەوت و گازی سروشتیی ناو کۆگە ( گەنجینە) کە لێك جیادەکاتەوە.

۲۳۵- رمل الغاز gas sand

گازە لم

بەردی گەنجینە، یان بەشێك لەو بەردەی گازی تێدایەو بە زۆری لمە بەرد دەبێت.

**٢٣٦- السطح بين الماء والغاز** gas water surface

**ڕووی نێوان ئاو و گاز**

بەشداریی ئاو و گازە لە ڕووەیەکی نێوانیاندا.

**٢٣٧- بئر الغاز** gas well

**بیرە گاز**

چاڵێکی قووڵە، گازی سروشتیی لێ بەرزدەبێتەوە و بیرەگازێکە دەشێت لە ڕووی ئابوورییەوە سوودی لێ وەربگیرێت، لەبەر بەتینی پەستان و زۆری گازو نزیکیی لە بازاڕەوە.

**٢٣٨- نطاق الغاز** gas zone

**ناوچەی گاز**

بەردە پێکهاتەیەکە، کەلێنی موییینی پڕ گازی سروشتیی تێدایە، لە ژێر پەستانێکی زۆر لە پەستانی ئاسایی زۆرتردا.

**٢٣٩- كسور شدّية** gash fractures

**برینەشکان، قڵیشە شکان**

قڵیشی گەورەی لەگەڵ درز، یان ناوچەی درزدا یەکتربڕە، کە لە زەبر پەیدا دەبێت.

**٢٤٠- باحة التجمّع** gathering area

**مەیان ( ناوچە ) ی کۆبونەوە**

ناوچەیەکی تەڵەی هایدرۆکاربۆنەکانە، کە بەزۆری لە ژێر ئارەزووی هەرێمیی گشتیدا دەبێت، کە ڕۆن، یان گازەکەی لێ ڕۆیشتبێ بۆ تەڵە بە ئاراستەی دژە ئارەزوو.

**٢٤١- حنيرة إقليمية، تقوّس ( في أديم الأرض )** geanticline

**کەوانەیەکی هەرێمی ( لەناخی زەویدا )**

پێکهاتەیەکە لەسەر پێوانەیەکی گەورە، کە بە گشتی هی سەرچاوەی زەمینیی ئەو نیشتانەیە، کە چاڵێکی گەورەی نزیك پێك دێت.

**٢٤٢- طيّات متزايدة** generative folds

**لۆچە دروستکارەکان**

ئـەو لۆچـانەن، کـە لەگـەڵ بـەرودواهاتنی چـینەکانی بەرزتردەبنـەوە ئـەوەیش ئەسـتووریی سـتراتیگرافی ( چـینزانییانە) بـەرەو ناوچـەی تـەوەرەیی لۆچـەکە زیاددەکات.

**٢٤٣- علم كيمياء الأرض = جيوكيمياء** geochemistry

**کیمیای زەیزانی = زەمینەکیمیا**

ئەو لقەی کیمیایە، کە تایبەتە بەشکاریی نموونە بەردینەکان، یان بەردینـەکان، بۆ زانینی پێکهاتن و بارودۆخی پێکهاتن و دابەشبوونی لە سروشتدا.

**٢٤٤- مقاطع جيولوجية** geological sections

**بڕگە جیۆلۆجییەکان**

ئەو وێنانـەن، کـە پێکهاتنی زەوی و سروشـتی بـەردەکان و پێوەنـدیی نێوانیـان ڕوون دەکەنـەوە، ئەگـەر بەخـەیاڵ بـە ئاراسـتەیەکی سـەرەکی لـە شـوێنێکی دیاریکراودا بڕیمان.

**٢٤٥- المسح الجيولوجي** geological survey

**ڕووپێوانی جیۆلۆجی (زەویزانی)**

ئەو لقەی زەویزانی ( جیۆلۆجی) ی تایبەتە بە دیاریکردنی سروشتی بـەردەکان و ئـەو خاوانـەی کـە تێیاندایـە لەسـەر نەخشـەی تۆپـۆگرافی ( ڕوخسـار، تایبەتمەندی).

**٢٤٦- مجال المغنطيسية الأرضية** geomagnetic

**بواری موگناتیسێتیی زەوی**

ناوچەی کاریگەریی موگناتیسێتیی زەوییە.

**٢٤٧- أقطاب المغنطيسية الأرضية** geomagnetic poles

**جەمسەرەکانی موگناتیسێتیی زەوی**

جەمسەرەکانی کایەی موگناتیسیی زەوی و دەکەوێتـە دووریـی نزیکـەی ٤٠٠٠ میل لە ڕووی زەوییەوە.

٢٤٨- سماعة أرضية ( جيوفون ) geophone

زەمینە بیستۆك ( جیۆفۆن )

ئامێرێکی بۆ دەنگ هەستیارە ( هەستناکە)، لە سیزمە ڕووپێویی جیۆفیزیکیدا بەکاردێت، لە سەر زەوی دادەنرێت و شەپۆلە دەنگیانە وەردەگرێت کە لە تەقینەوەیەك دەردەچێت و دەیاننێرێت بۆ ئامێرەکانی تۆمارکردن.

٢٤٩- شذوذجيوفيزيقي = شذوذ جيوفيزيائي geophysical anomaly

نائاساییێتیی جیۆفیزیکی = نائاساییێتیی جیۆفیزیایی

بەشێکی دیاریکراوە لە نەخشەی جیۆفیزیکی، کە لە دیمەنەکەیدا لە بەشەکانی تری نەخشەکە جیاوازە.

٢٥٠- الاستكشاف الجيوفيزيقي geophysical exploration

بەدواداگەڕان و دۆزینەوەی جیۆفیزیکی ( زەمینۆفیزیکی )

بەکارهێنانی ڕێگا زەمینۆفیزیکییە جۆراوجۆرەکانە، وەك موگناتیسێتی زەوی هەژێنیی (بوومەلەرزەیی) و خاوە خاوێیی و کارەبایی، بۆ گەڕان بە دوای خاوەجیاوازەکاندا.

٢٥١- علم الجيوفيزيقا = الجيوفيزياء geophysics

زەمینۆفیزیکزانی – زەمینۆفیزیازانی

زانستێکە، لەبەردو پێکهاتن و ناوەرۆکیان دەکۆڵێتەوە لە ڕووی گونجان و کارپێکرانی یاساکانی سروشتزانی (فیزیا) بەسەریدا.

٢٥٢- دروز الأرض geosutures

درزەکانی زەوی

ناوچە تاڕاددەیەك تەسك و نائارامن، کەوتوونەتە نێوان پارچە جێگیرو کەنار تەریبی بەردەکانی بنك لە توێکڵی زەویدا.

٢٥٣- طي جرماني germane type folding

قەد ( لۆچ ) ی جەرمەنی

ئەو پێکهێنانەی گەورە لۆچن، کە بەردەکانی ئەو زنجیرە شاخە کۆنانەی کە لە لۆچێکی ئەلپیی پێشتر قەددەکاتەوە.

٢٥٤- **الطرين الجلوبجريني** globigerina ooze

**ليتەی گلۆبیجرینی**

**نیشــتەی دەریــا قووڵەكانــە، كــە لــە بنچــینەدا لەســەدەفە قسـڵییە وردەكـانی گیانەوەری گلۆبیجرینا پێك دێت كە نیشتەی قوڕی تەڕ (لیتە)یە.**

٢٥٥- **طين الصدوع** gouge

**قوڕی درز**

**ئەو مـاددە بەردییـە هاڕدراوەیـە، كـە لـە ئـەنجامی جووڵـەی درزەكـان و هـاڕینی بەردەكان پێك دێت و لەو نیشانە سروشتییانەیە كە بەڵگەی بوونی درزن.**

٢٥٦- **الصدوع الخسف** graben faults

**چاڵە درز**

**ئـەو كۆمەڵـە درزانـەن، كـە بەكاریگـەری ئـەوان بارسـتەیەكی نێـوانیی بـەردەكان لەوانــە دەوروپشــتی دادەبــەزێت و دەبێتــە پێكهاتەیــەكی دروســتكار، كــە لــە كەندڕدەچێت.**

٢٥٧- **قاعدة جرانيتية** granitic basement

**بنكی گرانیتی**

**ئەو ((بنكە ئاڵۆزە) ەیە كە زۆربەی پێكهاتەكەی گرانیتـەو لـە قووڵایی (١٠-٢٠) كیلۆمەتردایە.**

٢٥٨ – **جرانيتين** granitine

**گرانیتین**

**ئاگرە بەردێكی بلووریوە، سێ كانزای تێدایە هەرچییەك بن جگـە لـە كانزاكـانی گرانیت.**

٢٥٩- **محبّب** granulose

**دەنكۆڵەیی**

**ڕەوشتێكە، بە هەموو ئەو تەنانە دەوترێت كە ڕووەكەی دەنكۆڵەی زۆر بچووكی تێدایـە، وەك سـەدەفی هەنـدێ كونكـەرە،یان بـەرگی سـوار و پەڕەكـەی هەنـدێ مەرجانی.**

٢٦٠- **مقياس الجاذبية** gravimeter = (gravity meter)

**پێوەری ڕاکێشان، ڕاکێشانپێو**

ئامێرێکە، جیاوازیی ( گۆڕانی) هێزی کایەی ڕاکێشانی زەوی پێ دەپێورێت.

٢٦١- **الطريقة الوزنية** gravimetric method

**کێشە ڕێگا، ڕێگای کێشی**

ڕێگەیەکە، لە برەشیکاریی ئاوێتەکاندا بەکاردەهێنرێت، بە پشت بەستن بە دیاریکردنی کێشەکان و کێشەڕێژەی ئەو ئاوێتانە.

٢٦٢- **طرق الإستكشاف بالجاذبية** gravimetric methods of exploration

**ڕێگەکانی دۆزینەوە بە ڕاکێشان ( بەڕاکێشان دۆزینەوە، کێشە دۆزینەوە )**

کنە تیاکردن و لێکۆڵینەوەی خاوە خانزاییەکان بە پێوانی قورسایی و قورسەخێراکاریی بەردەکان و ناوەڕۆکەکانیان لەناوچەیەکی دیاریکراودا بەبەکارهێنانی ئەو ڕاکێشانپێوی، گۆڕانکاریی کایەی زەمینەی ڕاکێشان دەپێورێت.

٢٦٣- أ- **کێشە پێوان** gravimetry

زانستی پێوانە، بە دیاریکردنی کێشەکان.

ب- ڕاکێشانپێوان.

کردەی قەبلاندنی ڕاکێشان، یان ڕەوڕەوەی ڕاکێشانە.

بەتایبەتی لە زانستی جیۆفیزیك و کارپێکەرە جیۆفیزیکدا.

٢٦٤- **الإنعزال بالجاذبية**

gravitational segregation=gravitational separation

**بە ڕاکێشان دابڕین= بە ڕاکێشان جیابوونەوە**

٢٦٥- **صدع جذبي = صدع عادي** gravity fault = normal fault

**ڕاکێشانەدرز = ئاساییە درز**

درزێکە، ئەو دیوارەی کە لەسەر ڕووەکەی بەرەو خوار هەڵواسراوە، لەچاو دیوارەکەی ژێرەوەیدا جووڵاوە.

**٢٦٦- سريان جذبي** gravity flow

**ڕاكێشه ڕەوین**

**جۆره جووڵەیەكی سەهۆڵە، لە بەفرەلاَنێكی ئارامی سەر ڕوویەكی لێژ، كە سەهۆڵەكە بە هۆی هێزی ڕاكێشانەوە بەرەو خوارەوەی لێژییەكە دەڕەوێت، یان وەك ڕەوینی نەوت بەسەر لێژییەكدا.**

**٢٦٧- بريق شحمي** greasy luster

**پیوە بریسكە**

**جۆره بریسكەیەكی تایبەتی ئەو كانزایانەیە، كە بریسكەی شووشە ڕۆنی هەیە، وەك كانی نەفیلین.**

**٢٦٨- التراب الأخضر** green earth

**سەوزە خۆڵ**

**نیشتە ماددەیەكی سەوزە، كە ئاسایی گلوكۆنایتەوە لە كەلێنەشێوە بادەمییەكانی بەردە بنكییەكاندا هەیە.**

**٢٦٩- الرخام الأخضر** green marble

**سەوزە مەڕمەڕ**

**لە زاراوەی بازرگانیدا ( بەزمانی بازاڕ): بەردی سەر بەنتینە، كە بەواتا جیۆلۆجییە ڕاستەكەی، مەڕمەڕنییە، هەر جۆره بەردێك كە شێوە و ڕەنگ و ڕوخسارێكی جوانی هەبێت.**

**٢٧٠- قلنسوه جليد جرينلند** Greenland ice cup

**سەهۆڵە كلاَوەی گرینلاند**

**ئەو ڕاخەرە سەهۆڵینەیە، كە زۆربەی ڕووی گرینلاندی داپۆشیوە، و بە زۆری پێی دەوترێت كلاَو و لەگەڵ كلاَوی جەمسەر (pole cap) دا تێكەڵ دەكرێت.**

**٢٧١- مارل الرمل الأخضر** greensand marl

**( مارل ) ی سەوز ( سەوزەلم )**

**مارل، یان لمێكە، كانی گلوكۆنیتی تێدایە.**

**٢٧٢- سحنة الشيست الأخضر** green schist facies

**ديمەنی سەوزە شیست .**

بەردی گۆڕدراون، لە پلەی گەرمیی نزمدا پێك هاتوون.

**٢٧٣- الحجر الأخضر** greenstone

**سەوزە بەرد، بەردی سەوز**

كۆنە ناوێكە لە بواری جیۆلۆجیدا بەكارهێنراوە، بەو ئاگرە بەردە تفتە گۆڕۆكانە دەڵێن، كە ڕەنگە سەوزەكە، یان لە تێدابوونی كلۆریت و هۆڕنبلەندو ئەپیدۆتەوە پەیدادەكەن.

**٢٧٤- مقياس المغنطيسية الأرضي** ground magnetometer

**زەمینەی موگناتیسێتیپێو**

ئامێرێكە، بۆ پێوانی كایەی موگناتیسی، لەسەر ڕووی زەوی .

**٢٧٥- مجموعة** group

**گرۆ، كۆمەڵە.**

ئەو بەشە بەردییەی ستوونی جیۆلۆجییە، كە بە دێژایی ڕۆژگار نیشتوون و لە ماوەی دەمێكی جیۆلۆجیدا پەیدا دەبێت و ئەو بەردینانەی كە بە گشتی تێیدان بەوە جیادەكرێنەوە، لە هی كۆمەڵەكانی تر جیاوازن.

**٢٧٦- مستحاثة دالة** guide fossil ( index fossil)

**نما بەردینە**

بەردینەی ماوەی ستراتیگرافی ( چینزانی ) تەسك و بڵاوبوونەوەی جوگرافیایی فراوان، كە بەو پێیە سوودی لە مێژووی جیۆلۆجی و پێكەوە بەستنی چینەكان و پیشاندانی تەمەنیاندا دەردەكەوێت.

**٢٧٧- مقياس المغنطيسية ( طراز جلف )** Gulf type magnetometer

**موگناتیسێتیپێو ( بابەتی گەلف )**

ئامێرێكە، بۆ پێوانی موگناتیسێتی، كە لەبنچینەدا لە فڕۆكەدا بەكاردێت و گۆڕانی كایەی موگناتیسێتیی گشتی تۆماردەكات بێ گوێدانە گۆڕانی ئاراستەكەی و بەناوی ( گەلف ) ی داهێنەرییەوە ناونراوە.

٢٧٨- **مجرى جاف** gutter

**وشكە جۆگە**

وشكە جۆگە و ڕێڕەوی ڕووبارێكە، كە لە دەمی سێیەمدا پەیدابووە و لیتەكەی زیڕی تێدایە، بە زۆری تاقوولێیەكی زۆر بە ماددەی گڕكانی داپۆشراوە.

٢٧٩- **صخر جبسي** Gypsumrock

**گەچە بەرد ( بەردەگەچینە )**

بەردێكە، زۆربەی لە گەچ پێك دێت و هەندێ جار بە هەربەردێكی وا دەوترێ كە بەرهەڵستیی كونبوون دەكات.

٢٨٠- **كهف الجبس** gypsum cave

**ئەشكەوتە گەچینە**

ئەشكەوتێكە، لە ئەنجامی توانەوەی بەردەگەچدا پەیدادەبێت.

٢٨١- **بَرَد** hail

**تەرزە**

دەنكە سەهۆڵی هەمە قەبارەو شێوەو نیوە ڕوونە، لە هەور دەكەونە خوارەوە و بە زۆری باو هەورە گرمە یان لەگەڵدا دەبێت.

٢٨٢- **حجر البَرَدْ** hailstone

**تەرزە بەرد**

دەنكە تەرزەیەكی گەورەیە، ئەوەندەی پرتەقاڵێكی گەورە دەبێت و دەشێت قورساییەكەی كیلۆگرامێك ببێت.

٢٨٣- **طابع حَجَر البَرد** hailstone imprint

**شوێنەواری تەرزە بەرد**

كەلێنێكی بچووكە بە هۆی كەوتنەخوارەوەی تەرزە بەردێك بەسەر نەرمە بەردێكدا پەیدادەبێت و بە زۆری فراوانترو قووڵترو كەمرێكترە لە شوێنەواری دڵۆپە باران.

٢٨٤- **زيوليت شعري** hair zeolite

**مووە زیۆلیت**

هاوواتای ڕیشاڵە زیۆلیتە و دەشێت نەترۆلیت، یان سكۆلیسیت، یان میزۆلیت بن.

٢٨٥- عمر النصف half life

نيوه تەمەن

ئەو كاتەيە، كەشيبوونەوەی نيوەی ژمارەی گەرديلەكانی توخمەتيشكنەكان پێی دەچێت، و ژمارەی گەريلەكانی توخمەكە دەبنە نيوەی ژمارەی گەرديلە سەرەتاييەكە.

٢٨٦- راسب هلوجيني halo genic deposit

هالۆجينە نيشتە

نيشتە ( نيشتو) ی خوێيەكی دەريايی هالۆجينەكانە

٢٨٧ – حمادة hammada

حەمادە

ڕووی بيابانێكی سەر بەردی ئەديمە ( ڕووی زەوی) يان بەردی ئەديم، كە توێژاڵە چەوێكی تەنك دای پۆشيوە، كە با، لم و خۆڵەكەی دوور دەخاتەوەو دەيبات.

٢٨٨- بنية سنامية hammock structure

كۆپارە پێكهاتە

دوو شێوە شكان، يان درزبردنن، كە بە تيژەگۆشەيەك يەكتر دەبڕن.

٢٨٩- ميزان تسوية يدوي hand level

تەرازويەكی تەختكردنی دەستی

ئامێرێكی تەختكردنی بچووكە، تەرازووی ئاوەكەی وا تێدا دانراوە، بە جۆرێك كە بينەر دەتوانێت لە هەمان كاتدا بڵقەكە ببينێت كە مەبەستێك لە تەلسكوپەكەوە (دووربينەكەوە) دەبينێت و ئامێرێكە لەكاتی بەكارهێنانيدا بەدەست هەڵدەگيرێت و بڵقەكە بەهۆی پوازك، يان ئاوێنەيەكەوە لە بۆريی دووربينەكەدا دەبينێت و بۆ دۆزينەوەی ئەستووريی چينەكان بەكاردێت.

٢٩٠- عينة يدوي hand specimen

نموونەيەكی دەستی

پارچە بەردێكە، دەبڕدرێت و بە شێوەی لاكێشە تەريبەكان كە دووريیەكانيان (١×٣×٤) گرێ ( ئينج) بێت، بۆ لێكۆڵينەوەی بە چاوی ڕووت و بە كۆمەڵ هەڵدەگيرێن بۆ لێكۆڵينەوە يان وەك سەرچاوەيەك.

hanging wall **٢٩١- الجدار المعلّق**

**ديوارى هەلۆسراو**

**ئەو بارستە بەردەيە، كە كەوتۆتە سەر ڕووى درزەكە.**

hanging wall of a fault **٢٩٢- جدار علوي للصدع**

**بەرزە ديوارى درز**

**ئەو ديوارەى لە نووكى بەردەكانى لاى سەرووى ئاستى درزبردن ، پێك دێت.**

hanging wall rocks **٢٩٣- صخور الجدار العلوي**

**بەردەكانى ديوارى سەروو**

**ئەو بارستە بەردانەن، كە دەكەونە لاى سەرووى ڕووى درزبردن.**

harmonic folding **٢٩٤- طيّ مُنَسَّق**

**لۆچى گونجاو**

**ئەو لۆچەيە، كە گۆڕانى كوتوپڕى تێدا نييە لە شێوەى لۆچەكاندا، هەرچەندێك قوولْ بێت.**

hastate **٢٩٥- سهمي**

**تيرى**

**شێوەى سەرەتيرى هەيە، بەلاّم پلە تفتەكانى تيژە، يان تەسكە بە گۆشەيەكى سەرەكى، يان نزيكە سەرەكى.**

hatch (hatching) **٢٩٦- تظليل بالخطوط**

**هێڵە سێبەركارى**

**ئەو هێلاّنەيە، كە لە داتاشين، يان وێنەكێشيدا بەكاردەهێنرێت تاكو سێبەرێك پيشان بدات.**

heave **٢٩٧- الفسحة**

**فراوانى**

**ئەو ماوە ئاسۆييەيە، كە بەردەكە لەكاتى درزبردنيدا دەخزێت، ئەگەر درزى برد.**

٢٩٨- صدع مُفَسّح = درزی فراوانکەرە heave fault

صدع طارد= درزی دەرکەرە trans current fault

صدع مُستعرض = درزی پانکەرە transverse fault

ئەو درزەیە، کە هەردوولا بەبزوتنەوەیەکی ئاسۆیی دەی بزوێنن و فڕێدانی سەرەکی و تەنیشتە هەڵچو و تەنیشتە داچووی نییە، بەڵام فراوانییەکی دەبێت ( لادانی ئاسۆیی)، کە هەندێ جار دەگاتە هەزاران مەتر.

٢٩٩- النفط الخام الثقيل heavy crude oil

نەوتی خاوی قورس

ئەو ماددە نەوتییە سەرەتاییەیە، کە لە زەوی دەردەهێنرێت و کێشی جۆرییەکی لە چاو خۆیدا بەرزی دەبێت.

٣٠٠- صدع كبير الزاوية high angle fault

درزی گۆشە گەورە

درزێکە، لارییەکەی لە ٤٥ پلە زیاترە

٣٠١- حزام مفصلي hinge belt

جمگە پشتێن، پشتێنی جمگەیی

پشتێنێکە لە لۆچی خواروو، چالاییەکی گەورەی پێشەوە لە بەرەیەکی زەمینیی کیشوەری جیادەکاتەوە.

٣٠٢- أرض المـؤخّرة hinter land

پاشە زەوی

پارچە زەوییی ناجێگیر، کە بە هۆی جوولانیەوە پەستانێك دەخاتە سەر ئیشەکانی چاڵ و چۆڵە ناوچەییەکان بەرەو پێشە زەوی و لۆچبوون و درزبردن و دەرپەڕینی لە شێوەی زنجیرە شاخدا.

٣٠٣- متجانس الميل homocline

هاولاری، هاولێژی

کۆمەڵە چینێکی هاولارین و دەشێت سەرێکی یەك لۆچ بن.

**٣٠٤- طبقات مجانسة لامتزامنة** homotaxes(homotaxial beds)

**چینە هاولارییە ناهاوکاتەکان**

**چـینی ناهاوکـاتی لێکچـوو هاودیمـەن و چـونیەکن لـە بـەرو دوایـی شـوێنە ڕێژەییەکانیان لە ستوونی جیۆلۆجیدا.**

**٣٠٥- الطيّ المتجانس** homotaxial folding

**لۆچی چونیەك ( هاوچین )**

**لۆچێکی بەردەکانە بە تەوەری پێك تەریب ڕوودەدات.**

**٣٠٦- تجانس الطبقات** homotaxis

**هاوچینی، لێکچوون چینەکان**

**وەسـفی دوو کۆمەڵـە چـینە، کـە هەریەکـەیان بەردینـەی چـونیەکیان تێدایـە، کـە نیشانەی ئەوەیە بارودۆخی چینە بەرودواییان چونیەکە.**

**٣٠٧- أفق** horizon

**ئاسۆ، تان**

**چینێکی ئەسـتوور، یـان کۆمەڵـە چـینێکی تـەنکن، کـە قۆنـاغێکی دیـاریکراوی بەرودوایی ستراتیگرافی، یان ڕۆژگاری جیۆلۆجییان پیٚ دەدۆزرێتەوە.**

**٣٠٨- صدع أفقي** horizontal fault

**درزی ئاسۆیی**

**درزێکە، بەلادانی سەرەکی پەیدا نابێت.**

**٣٠٩- الفصل الافقي** horizontal separation

**جیاکردنەوەی ئاسۆیی**

**ماوەیـەکی پێوەندیـدارە بـە وەسـفی درزەکانـەوە ، بـە ئاراسـتەیەکی ئاسـۆیی دیـاریکراو لـە نێـوان دوولای ئاسـتێکی ڕێنمـایی درزبـردوی وەك چـین، یـان دەمار، یان برە یەك .**

**٣١٠- فروع خطية أفقية** horizontal graptolitic stipes

**هێڵە لقی ئاسۆیی**

**ئـەو لقانـەن، کـە ئاسـۆیی درێژدەبنـەوە لـە پنتـی لـق هاویشـتنی بنکـەی گرابتۆلیتییەوە.**

# (I)

٣١١- البنية المتراكبة imbricate structure

پێکهاتە پێکداچووەکان (تێکەڵبووەکان)

پێکهاتەیەکە، لە چەند درزێکی پاڵپێوەنان پەیدا دەبێت، کە هەموویان بەلایەکدا لاربوونەتەوە و پارچە بەردەکان لەسەریەك پێکدادەچن.

٣١٢- صدع عادي مائل inclined normal fault

درزێکی ئاسایی لار

٣١٣- طبقة لاصاملة incompetent bed

چینی ناسەخت

چینە بەردێکی نەرمە، بە جووڵە زەمینییە لاوەکییەکان کاریان تێ دەکرێت و شوێنەواری لۆچبوونیان بە زۆری تێدا دەردەکەوێت.

٣١٤- طيّ حقني injection folding

تێکردنە لۆچ

لادانێکە بەکاری جووڵە زەمینییەکان تووشی چینێکی گونجۆکی نێوان چینە سەختترەکان دەبێت، و لە گۆڕانی جیاوازی .ئەستووری پەیدا دەبێت.

٣١٥- سطح بيني interface

نێوانە ڕوو

ڕووی جیابوونەوەیە لە نێوان دوو پۆلدا، وەك ڕووی جیابوونەوەی نێوان ڕۆن و ئاو.

٣١٦- طيّ بيني interfolding

نێوانە لۆچ

هاوکاتیی لۆچەکان، ئاراستە جیاوازن و لەگەڵ یەکتردا پێکدا ناچن.

**٣١٧- نسيج ما بين الحبيبات** intergranular texture

**ڕستی نێوان دەنکۆڵەکان**

ڕستی بەردەکانی بازاڵت و دۆڵریتە، بلووری ئۆجێت، یان ئۆلیفین، یان هەردووکیانی بەپەرت و بڵاوی تێدایە، لە تۆڕی بلووره پانەکانی پلاجیۆکلاز چاو پڕدەکەنەوە.

**٣١٨- التصدّع المتقّطع** intermittent faulting

**پچڕە درزبردن**

ئەو درز بردنەیە، کە بە چەند قۆناغێك ڕوودەدات، کە چەند دەمێکی ئارامی لێکیان جیادەکاتەوە.

**٣١٩- ماء خلالي** interstitial water

**نێوانە ئاو**

ئەو ئاوەیە، کە لە کەلێنە نێوانییەکانی بەرد، یان هەر ناوەندێکی کونیلەداردا هەیە.

**٣٢٠- مماس التدخل** intrusive contact

**بەرکەوتەی چوونەناو**

ئەو ڕووەیە، کە شلەوەبووەکان لەگەڵ بەردەکانی ناوچەکە بەریەکتردەکەون و پلەیەکی دیاریکراو گۆڕانی تێدا ڕوودەدات، یان پارچەکانی دەگرێتە خۆی و لەگەڵ ماددەکەی یەك دەگرن.

**٣٢١- الانقلاب** inversion

**هەڵگێڕانەوە**

چەند بارەبوونەوەی لۆچبوون لە چینەکاندا، کە پێچەوانەبوونەوەی سیستمی بەرودوا داچوونەکەی لێ پەیدادەبێت.

**٣٢٢- طرف طيّة مقلوب** inverted limb of a fold

**سەرەلۆچێکی ئاوەژو**

وەسفی سەرەلۆچەکەیە، ئەگەر ئاوەژو ( هەڵەوگێر) بێت.

inverted plunge
٣٢٣- **غطس مقلوب**

**نقومبوونی هەڵەوگێر ( ئاوەژو )**

نقومبوونی لۆچێك، بەو شێوەیەی چینە تەمەن تازەترەکان لە ژێر چینە تەمەن کۆنترەکاندا دادەنێت.

isoclinal fold
٣٢٤- **طيّة متماثلة الميل**

**لۆچی هاولاری**

لۆچێکە، هەردوو سەرەکەی بەهەمان ئاراستە لاردەبنەوە، وە قۆقز، یان چاڵ دەبن.

isocline
٣٢٥- **تماثل الميل**

**هاولارییوون**

(أ) زنجیرە چینێکە، هەموویان بەلایەکدا لاردەبنەوە.

(ب) قۆقزی، یان چاڵییەکی دابینکەری وایە کە بەردە ئەمسەرو سەر پێکهێنەکان هەموو بە هەمان لادا لاردەبنەوە.

# (J)

joint
٣٢٦- **فاصل**

**جیاکەرە، جمگە**

درزێکی سروشتییە لە بەردێکدا، کە بە هیچ لایەکیدا چینەکانی ناجووڵێت.

jointing
٣٢٧- **تفصل**

**جیابوونەوە، بوونە جمگە**

کردەی درزبردنی سروشتییە لە چینە بەردەکاندا.

# (K)

**٣٢٨- طبقة دالّة** key bed

**چيننما، چينپيشاندەر**

(أ) چينێكە، ڕەوشی دياری هەيە، كە بە ئاسانی پێی دەناسرێتەوە لە پێكەوە بەستنی بەردەكاندا.

(ب) چينێكە، يەكێك لە ڕووەكانی بۆ نەخشە سازيی ئاقارە تەلارسازييەكان بەكاردێت.

**٣٢٩- أفق دال** key horizon

**ئاسۆنما، ئاسۆ پيشاندەر**

يەكێكە لە دوو ڕووەكەی چينێك، يان پێكهاتەيەكی ديمەن ديارکە زۆر سوود بەخشە لە چينزانی و بنياتزانيدا.

**٣٣٠- تغيّر جانبي** lateral variation

**تەنيشتە گۆڕان**

دياردەی گۆڕانی سروشتی بەردە، لە چينێكەوە بۆ يەكێكی تر، وەك گۆڕانی چينە لمينە بۆ چينە قوڕينە.

**٣٣١- صدع جانبي** lateral fault

**تەنيشتە درز، لادرز**

خليسكە درزێكی كوتەكييە، بە جۆرێك جووڵەی تێدا ڕووی داوە كە بينەری بەرەو درزەكە ڕۆييو لەسەرو ئاستی ڕێبەرێكی دياريكراو ( وەك چين، يان دابڕ، يان دەمار)، پێويستە بەرەو چەپ لابدات، تاكو بەرانبەر بەشەكەی تری، ڕێبەرە ئاستی لە شوێنی خۆلابراو دەبێتەوە

**٣٣٢- عدسة** lens

**هاوێنە، نيسكە**

زاراوێكە، بە بەرد دەوترێت، كاتێك ئەستوورييەكەی بە هەموو لايەكدا كەم دەكات و دوور لە ناوەراستەكەی تەنك دەبێت .

**٣٣٣- تعدُّس** lesing

**هاوێناندن، نیسکاندن**

تەنکبوونی چینێکە، بە چەند لایەکدا، بەوەیش شێوەکەی وەك هی نیسکی لێ دێت.

**٣٣٤- النفط الخام الخفيف** light crude oil

**نەوتی خاوی سووك**

ئەو نەوتە خاوەیە، کە لە زەوی دەردەهێنرێت و کێشی جۆرییەکەی لەچاوخۆدا سووکە.

**٣٣٥- الطيّات الخطية** linear folds

**هێڵە لۆچەکان، لۆچە هێڵییەکان**

ئەو لۆچی نیشتە بەردانەیە، کە درێژیی چەند ئەوەندەی پانییەکەیەتی و مێخی پەلەکانی پێك تەریبن بە درێژایی ماوەی زۆر.

**ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو هێڵە لۆچانە :**

(أ) **هێڵە لۆچە ڕاستەکان** straight linear folds

ئەوانەن، کە تەوەرەکانیان بە ئاقارێکی ڕاستن.

(ب) **هێڵە لۆچە چەماوەکان** arcuate linear folds

ئەوانەن، کە تەوەرەکانیان کەمێك چەماونەتەوە.

(ج) **هێڵە لۆچە سیگماییەکان** sigmoidal linear folds

کە چەمانەوەکەیان وەك هی تیپی سیگمای زمانی یۆنانی وایە.

(د) **هێڵە لۆچە پێپیلکەییەکان** echelon linear folds

ئەوانەن، کە باری تەوەرەکانیان، وەك هی پلەی پەیژەوابوون.

(هـ) **هێڵە لۆچە پەروانەییەکان** virgation linear folds

ئەوانەن، کە تەوەرەکانیان فراوان دەبن لێك دەکرێنەوە بە شێوەی پەروانەکانی پانکەیەك.

(و) **هێڵە لۆچە دوو لقییەکان** dichotomic linear folds

**ئەوانەن، کە تەوەرەکانیان لقیان لێ دەبێتەوە، وەك لق و پۆپی درەخت.**

**٣٣٦- الطرف الطويل** long limb

**پەل درێژ**

**تەنیشتی ئەو لۆچە ناچونیەکەی لە پەلەکەی تر درێژتردەبێتەوە پێش هەڵگەڕانەوەی لاری و بە گشتی لاکەملارترەکەی ئەو لۆچەیە.**

**٣٣٧- صدع طول** longitudinal fault

**درێژە درز**

**درزێکە، مێخەکەی تەریبە لەگەڵ پێکهاتەی گشتیی ناوچەکە.**

**٣٣٨- فاصل طولي** longitudinal joint

**درێژە جمگە**

**جمگەکەیە، بە تەریبی هێڵەکانی ڕەوین لە ئاگرە بەردەکاندا درێژ دەبێتەوەو لاتر و دەرکەوتووتر دەبێت، چونکە هێڵەکانی ڕەوین نا ئاسۆیی دەبن.**

**٣٣٩- صدع قليل الزاوية** low angle fault

**درزی گۆشە بچووك**

**دزرێکە، گۆشەی لارییەکەی لە ٤٥ پلەکەمتر دەبێت.**

# (M)

٣٤٠- أ . ق. م. m.f.c.(meter feet cube)

**م.پ.س. ، كورتەی ( مەتر پێ سێجا ) یە.**

٣٤١- **مقياس المغنطيسية** (**مغنطومتر**) magnetomtere

**موگناتیسێتیپێو**

**ئامێرێکە، بۆ پێوانی هێزی موگناتیسێتی بەکاردەهێنرێت.**

٣٤٢- **شذوذ مغنطيسي** magnetic anomaly

**موگناتیسە ناباوی**

**بەشێکی دیاریکراوی نەخشەیەکی موگناتیسییە، دیمەنەکەی لەبەشەکەی تری نەخشەکە ناچێت.**

٣٤٣- **الإنحراف المغنطيسي** magnetic declination

**لادانی موگناتیسی**

**گۆشەی نێوان ئاستی نەمانی موگناتیسی و ئاستی نەمانی جوگرافیاییە لە شوێنێکی ئەم ڕووی زەمینەدا.**

٣٤٤- **الميل المغنطيسي** magnetic dip

**لاریی موگناتیسی**

**ئەو گۆشەیەیە، کەبەرەنجامی کایەی موگناتیسیی زەوی، لەگەڵ ئاسۆ دروستی دەکات.**

٣٤٥- **طرف الاستكشاف المغنطيسي** magnetic methods of exploration

**ڕێگەکانی دۆزینەوەی موگناتیسی**

**ڕێگەکانی بە دواداگەڕانی خاوە کانزاییەکان بە پێوانی موگناتیسێتیی بەرد و کانەکانی شوێنی تۆژینەوەکە و بنچینەی بەکارهێنانی، لە کنەو پشکنینی کانە موگناتسێتیەکانی ئاسن.**

٣٤٦- **عاصفة مغنطيسية** magnetic storm

**گەردەلوولی موگناتیسی**

گۆڕانێکی کتوپڕی بواری ( کایەی) موگناتیسێتیی زەوییە، کە زۆر ناوچەی بەرینی ڕووی زەوی دەگرێتەوە.

٣٤٧- **سحنة بحرية** marine facies

**دیمەنی دەریایی**

ئەو ڕەوشە دیمەنییانەیە کە هەر نیشتەیەکی دەریایی پیێ دەناسرێتەوە.

٣٤٨- **كسر رئيسي** marine fracture

**شکانی سەرەکی**

(أ) ناوچەیەکی پشێوییە، بە درێژایی بارستەیەکی کیشوەری، کە ناقوولاَیی سەدان میل درێژدەبێتەوە و کرۆکی زەمینە هەژێ قوولەکان دەگرێتەوە.

(ب)درزەها، یان درزە سیستمی گەورەن، کە پەیوەستن بە تەنیشتە جووڵەی توندەوە، کە کارێکی گرنگیان هەیە لە پێکهاتەی دروستکاریی توێکڵی زەویدا.

٣٤٩- **هجرة** migration

**کۆچ**

جووڵانی ڕۆن، یان گاز، یان ئاوە بەناو بەردێکی کونیلەداری دادەردا.

٣٥٠- **هجرة متوازية** migration, parallel

**تەریبە کۆچکردن**

جووڵانی ڕۆن، یان گاز، یان ئاوە، بەناو بەردێکی کونیلەداری دادەری تەریبی ڕووە چین چینەکەدا.

٣٥١- **هجرة مستعرضة** migration, transverse

**پانە کۆچ، کۆچی ئەمبەرەوبەر**

جووڵانی ڕۆن، یان گاز، یان ئاوە بەناو بەردی کونیلەداری دادەرو ڕووە چین چینەکەدا.

mineral oil ٣٥٢- **زيت معدني**

**كانه ڕۆن**

**شـلێکی زەردبـاوی لـە ئـاو سـووکترەو لـە هایدرۆکاربۆنـەکان پێـك دێـت، بـەڵام نەوتی خاو، لە نەوتا ( نەفثا) قورسترە، و سەوزێکی تێرەو نەوت و نەوتا لەبەرد دێنەدەرەوە، بەڵام نەفپا (نەوتا) لە خودی نەوت دورست دەکرێت.**

mixed base ( in crude oil) ٣٥٣- **خام خليط ( في الزيت الخام )**

**تێکەڵەخاو ( لە ڕۆنی خاودا )**

**زاراوێکـــە ، بـــەو ڕۆنـــە خـــاوە دەوترێـــت کـــە هایدرۆکاربۆنـــە پـــاڕافینی و نەفثینییەکانی تێدایە، بێئەوەی یەکێکیان زاڵبن بەسەر ئەوی تریاندا.**

monocline ٣٥٤- **وحيد الميل**

**یەکلارە**

**پێکهاتەیەکـە، لـە هەنـدێ شـوێنی دیـاریکراوی چینە ئاسـۆییەکاندا هەیـە، کـە چینەکان شوێنە لارییەکیان لە یەك لاوە تێدایە.**

montmorillonite ٣٥٥- **مونتموريللونيت**

**مۆنتمۆریللۆنیت**

**کۆمەڵە کانە قوڕینەیەکن، شێوگە پێکهاتنەکەیان لـە شـێوەی گشـتیی ( $Al_2 Si_4 O_{10} (H)_2$) وەگرتووە، هەر کاتێك خرایە ئاوەوە، هەڵدەئاوسێت.**

mud fluid = drilling fluid ٣٥٦- **مائع طيني = مائع الحفر**

**قوڕە شلۆك = شلۆکی هەڵکەندن**

**ماددەیەکی شلە، بە زۆری قوڕێکی گونجاوی لەگەڵ ئاوو ئاوێتەکیمیایی و کانە کییەکان باش تێکەڵکراوە. لە هەڵکۆڵینکاریدا بەکاردێت ، بۆ ڕزگاربوونی لە بڕشـتی پەیـدابوو و پاراسـتنی دیـوارە هەڵکۆڵراوەکـە و چـڕییەکەی بـەپێی پەستانی ناو بیرەکەیە.**

**٣٥٧- مضخة طين** mud pump

**ترومپای قوڕ هەڵهێنجێن**

ترومپایەکە، پاڵ بە قوڕاوی ناو بۆریی هەڵکولێنەکەوە دەنێت و بڕشتی بەردە پەیدابووەکە، بەرزدەکاتەوەو دیگوێزێتەوە بۆ دەری بۆریی هەڵکەندنەکە.

**٣٥٨- صدوع متعدّدة** multiple faults

**فرە درزەکان**

کۆمەڵە درزێکی لێك نزیك و بە شێوەیەکی گشتی تەریبن.

# (N)

٣٥٩- **الصخور المغتربة** nappe

**بەردە کۆچکردووەکان ( نامۆکان )**

**تەنی زۆر گەورەی بەردن، لە شوێنە سەرەتاییەکانیانەوە نزیکە میلێك جوولاٌون و لەسەر بەردی تری نامۆ جێگیربوون، ئەم جوولەیە لۆچبوونێکی فرەگەورە پەیدا دەکات.**

٣٦٠- **ناترۆلیت** natrolite

**ناترۆلیت**

**کانێکی زیۆلیتەکانە و پێڕەویی سیستمی بلووریی لە بزینەیی دەکات، شێوگی پێکهاتنەکەی بەمجۆرەیە:** $Na_2AlSi_3O_{10}.2H_2O$

٣٦١- **نطرون** natron

**ناترۆن**

**کانێکە، پێڕەویی سیستمی بلووریی یەکلارە دەکات، شێوگی پێکهاتنەکەی** ($Na_2CO_3.10.H_2O$) **یە.**

٣٦٢- **غاز طبيعي** natural gas

**گازی سروشتی**

**گازێکە، لە ناخی زەوی و لەو ناوچانەی نەوتی تێدایە، دەردەهێنرێت و تێکەڵێکی هایدرۆکاربۆنە گازەکانی وەك میثان و ئیثان و پرۆپان و بیوتانە، هەروەك دەشێت هەڵمی هەندێ شلەنەوتییە پلەی کوڵان نزمەکانی تێدا بێت.**

٣٦٣- **سوائل غاز طبيعي** natural – gas liquid

**شلەکانی گازی سروشتی**

**ئەو تێکەڵە هایدرۆکاربۆنە شلانەن، کە لە نەوتە گەنجینەکەدا گازن بەلاٌم بە خەستکردنەوەو ڕوو مژین دەردەهێنرێت.**

**٣٦٤- باحات سالبه** negative areas

**ناوچە سالیبەکان**

ناوچە نزمەکانی ژێر ئاستی دەریا ئەو ناوچە نائارامانەی تویکڵی زەوین، کە جووڵەی دابەزینی خاویان تێدا ڕووداون و بۆتە هۆی کەڵەکەبوونی نیشتەنییەکان.

**٣٦٥- جملة الانزلاق ( إزاحة كلّية )** net slip

**تەواو خزین ( تەواولادان )**

بڕی تەواوی خزینی یەکێك لە دوو دیوارەکەی درزێك لەسەر دیوارەکەی تری و ئەو ماوەیەیە کە لەسەر ڕووی درزەکە و لە نێوان دوو پنتی سەر دیوارەکانی درزەکە، کە پێش درزبردنەکە دراوسێ بوون.

**٣٦٦- التباين** nonconformity

**نەگونجان**

بەرزترین پلەی نەگونجانە، کە دوو کۆمەڵە نەگونجاوەکە، لە دوو جۆر بەردی جیاوازدەبن، کە کۆمەڵە ئاگرە بەردە کۆنەکەو کۆمەڵە نیشتە بەردە تازەکەن و ڕوویەکی داماڵینی دیار، لێکیان جیادەکاتەوە.

**٣٦٧- قُبّة ملحيّة لا اختراقيـة** nonpiercemant salt dome

**گۆمەزە خوێیینەیەکی نەسمراو**

گومەزە خوێینەیەکە، خوێیەکە، ئەو نیشتانەی سەر خۆی ناسمێت و نایبڕێت.

**٣٦٨- طيّة غير غاطسة** non plunging fold

**لۆچی نقومنەبوو**

لۆچێکە، تەوەرەکەی، ئاسۆییە و ئەگەر تەوەرەکەی لاربووەوە، نقومنەبووە.

**٣٦٩- حنيرة مركبة عادية** normal anticlinorium

**گومەزی ئاوێتەی ئاسایی**

قۆقزێکە، ئاستە تەوەرەییەکانی لۆچە ناوەنجییەکانی لە ئاقاری خوارەوەیدا پێك دەگەن.

٣٧٠- ميل عادي normal dip

لاریی ئاسایی

لاریی گشتی، یان ناوچەیی بەردە چینە چینەکان، بە درێژایی ناوچەیەکی فراوان بێ گوێدانە ئەو لارییە خۆماڵییانەی لە بوونی هەندێ پێکهاتەی زەمینیی خۆماڵیی بچووك پەیدا دەبن.

٣٧١- صدع عادي normal fault

درزی ئاسایی

ئەو درزەیە، کە دیوارە هەڵواسراوەکەی لە چاودیوارەکەی خوارەوەیدا دادەبەزێت.

٣٧٢- جناح طرف عادي normal limb

پەلی (سەری) ئاسایی

ئەو سەرەی لۆچە هەڵەوگێرەیە، کە ڕیزبوونی بنچینەیی چینەکانی وەك خۆی دەپارێزێت بێئەوەی بگۆڕدرێت.

٣٧٣- تقعر مركب عادي normal synclinorium

چاڵایی ئاوێتەی ئاسایی

چاڵۆکەیەکە، ئاستە تەوەرەییەکانی لۆچە ناوەنجییەکانی ئاقاری خوارووی پەرت دەکات.

٣٧٤- حَدَبة noes

قۆقزۆکە

قۆقزییەکی تەواو نەشمونما نەکردووە، لە لووت دەچێت، چونکە لۆچەکەی لە یەك لاوە دیارە .

## (O)

oblique fault **٣٧٥- صدع مائل**

**درزی لار، لاره درز**

درزێکه، بەرکەوتەکەی لارە لەسەر بەرکەوتەی چینەکان.

oblique joint **٣٧٦- فاصل مائل**

**جمگەی لار، لارە جمگە**

جمگەیەکە، بەرکەوتەکەی لاردەبێتەوە بەسەر بەرکەوتەی چینە دراوسییەکانیدا.

oblique- slip fault **٣٧٧- صدع مائل الانزلاق**

**درزی خزانلار**

درزێکە، سەراپای خزان تێیدا، لە نێوان ئاراستەی لاری و ئاراستەی کوتەکدایە.

oil accumulation **٣٧٨- تراكم النفط**

**کۆبوونەوە کەڵەکەبوونی نەوت**

کۆبوونەوەی نەوتە لە ڕاوگەدا یان پیشەسازییانە کۆکردنەوەیەتی لە گەنجینەدا.

oil layer **٣٧٩- طبقة النفط**

**چینە نەوت، کۆگەی نەوت**

نەوتی کۆوەبووە لەناو ناوچەیەکی(چینێکی) دیاریکراودا، وەك لە ناخی زەویدا.

oil pool **٣٨٠- بركة النفط**

**گۆمەنەوت، مۆژەنەوت**

نەوتی کۆوەبووە لە کونیلە کەلێنەکانی بەردە نیشتەنییەکاندا کە لەکاتی هەڵکەندندا بەرهەم دێت.

**٣٨١- موارد نفطّية** oil resources

**داهاتی نەوتی، نەوتە داهات**

**ئەو بڕە نەوتەی لەناخی زەویدا کۆبووەتەوەو ئەوەی کەلێی دەردەهێنرێت.**

**٣٨٢- رمل النفط** oil sand

**لمی نەوت**

**زاراوێکی گشتییە بە هەموو لمە بەردێکی نەوت تێدابوو دەوترێت.**

**٣٨٣- طَفَل الـنفط** oil shale

**قوڕی نەوت**

**قوڕێکـە، ڕێژەیـەك هایـدرۆکاربۆنی تێدایـە وای لێ دەکـات نـەوتی بـە لەناوبـەرە دڵۆپاندن (واتە بێ هەواگەرمکردن) لێ دەربهێنرێت.**

**٣٨٤- مستافو النفط** oil smellers

**نەوت بۆنکەران**

**ئـەو کەسـانەن، کـە وای دەبیـنن، بتـوانن شـوێنی بـوونی چـینەنەوتدارەکان بناسنەوە و شوێنی گونجاو بۆ هەڵکەندن دیاری بکەن لە پێناوی دەرهێنانیدا.**

**٣٨٥- طيّة مفتوحة** open fold

**لۆچی کراوە**

**لۆچێکە، هەردوو سەرەکەی بە گۆشەیەکی گەورەکرابێتەوە.**

**٣٨٦- منكشف الصـخر** outcrop

**بەرد دۆزەرەوە ( بەرد دەرخەرە )**

**ئەو بەشەی چین یان بارستە بەردینەیەکە لەسەر ڕووی زەوی دەردەکەوێت.**

**٣٨٧- طيّة مُنكفئة** over fold= turned fold = over thrown fold

**لۆچی گەڕاوە**

**لۆچێکە، باری بنـەڕەتی چینەکان لـە یـەکێك لـە دوو سـەرەکەیدا پێچەوانە دەبێتـەوە، چونکە لەسەر گۆشەیەکی لە ٩٠ پلە گەورەتر پێچ دەخوات.**

٣٨٨- قبّة الملح المظلية — overhanging salt dome

**چەترە گومەزی خوێ**

گومەزەکانی خوێ، کە شێوەی چەتر بە خۆوە دەگرن و پێی دەوترێ ، کەبەزۆری لە هێلانەی قەلەڕەش (قاژو) دەچێت.

٣٨٩- التجاوز — overlap

**بەسەرداتێپەڕین، تێپەڕاندن**

لێ تیپەڕینی نیشتە بەردە نوێیەکان لەو سنوورەی بەردە لەو کۆنترەکان گەییشتوینێ، ئەو دیاردەیە، بە هۆی هەڵچوونی دەریاکانەوە ڕوودەدات.

٣٩٠- دسرة شديدة — overthrust

**توند داکشان**

(أ) داکشاوە درزبردنی کەملارو سەراپا داخزانی گەورە کە میلەها زیاتر دەبێت.

(ب) داکشاوە درزبردن، کە هێمانەی کاراتێیدا دیوارە هەڵواسراوەکەیە نەك دیوارەکەی خوارد.

(ج) ئەنجامی کردەی داخزانی دیوارە لە چاو خۆدا هەڵواسراوەکە بەسەر دیوارەکەی خواروی درزبردنەکەدا.

٣٩١- غطاء دسرشد — بەرگی توند داکشان — over thrust sheet

كتلة دسرشديد — بارستە توند داکشان — over thrust block

ئەو بارستە، بەردانەی سەر ئاستی درزی گۆشە نزم، کە ماوەی چەند میلێك ڕادراوە.

٣٩٢- طرف مقلوب — over turned limb

**سەری هەڵگەڕاوە ( ئاوەژوو )**

یەکێکە لەو دوو سەرە چەند بارەبووەی بە گۆشەیەکی لە ٩٠ پلە گەورەتر پێچ دەخوات لە کاتی چەند بارەبوونی لۆچبووندا.

# (P)

**٣٩٣- علم البيئة القديمة** palaeoecology

**ژینگەی کۆنزانی**

**ئـەو بەشـەی بەردینـە زانییـە، کـە تایبەتـە بـە خوێنـدن و لێکۆڵینـەوە و بـۆ دەرکەوتنی ئەو ژینگە کۆنانـەی کـە بـەردە جۆراوجۆرەکـانی تێدا نیشتوون لـە خوێنـــدنی بایەخپێدانـــە فیزیـــایی و کیمیـــایی و زینـــدەیی کۆنـــەوە، کـــە گرنگترینیان لەو بەردینانەوە کە لەو بەردانەدا هەن وەرگیراون.**

**٣٩٤- الجغرافية القديمـة** palaeogeography

**جوگرافیای کۆن**

**زانستێکە، کە تێیدا لە زەوی دەتوێژێتەوە لە ڕووی گەشەی جوگرافیاییـەوە، لـە کاتی چەرخە جیۆلۆجییەکانەوە.**

**٣٩٥- خرائط ماقبل التحرف** palinspasctic maps

**نەخشەکانی پێش شێوان**

**ئـەو نەخشـە جیۆلۆجییانـەن کـە دابەشـبوونی بـەردەکان و بارودۆخیـان ڕوون دەکاتەوە، پێش ئەوەی جووڵەکانی لۆچبوون و درزبردنیان بەسەردا بێت.**

**٣٩٦- طيّة محيطة تحُدبية** pericline

**لۆچێکی چێوەگری قۆقزی**

**پێکهاتەیەکی قۆقزییە، قۆقزییەکـەی زۆر سـووکە، مانـدووبوونی قۆقزبـوونێکی بنەڕەتی لە سەریکیەوە پیشان دەدات، وەك دابـەزینی تەوەرەکـەی و کرانـەوەی دوو سەرەکەی بەو ئاراستەیەدا.**

**٣٩٧- صخر نفوذ** permeable rock, pervious rock

**بەردێکی دادەر**

(أ) **ڕەوشـتێکی ئـەو بەردەیـە کـە لـە بارودۆخـە ئاسـاییەکانی پەسـتانی ئـاوی زەمینیدا، ئاوی پێدا تێ دەپەڕێت.**

(ب) **بەردێکە، کەلێنی بۆشی بە موولوولە پێکەوە بەستراوی تێدایە.**

**٣٩٨- نفوذية** permeability

**دادان، یان گوزەرکردەیی**

**توانستی بەرد، بۆ پێدا تێپەڕکردنی شلێك**

**٣٩٩- معامل النفوذية** permeability coefficient

**هاوکۆلکەی گوزەرکردن**

پلەی ڕەوینی ئاوە بەگالۆن لە ڕۆژێکدا لە برگەی پێ سێجایەکدا، لە ژێر یەکەیەکی پلە بەندیی هایدرۆلیکیدا.

**٤٠٠- التحليل النسيجي** petro fabric analysis

**پێکهاتە ( ڕایەڵە ) شیکاری**

ئەو لێکۆڵینەوە جیۆلۆجییەیە کە هەوڵ دەدات لە بنەڕەت و چۆنێتیی ڕیزبوونی ئەو بەشانەی کە بەردیان لێ پێك دێت و ئەو جووڵانانەی کە دەبنە هۆی ئەو ڕیزبوونە بگەین.

**٤٠١- نفط = بترول ،زيت الصخر( باليونانيه )** petroleum

**نەوت = پێترۆڵ ( بەردە ڕۆن ) بەیۆنانی**

ماددەیەکی هایدرۆکاربۆنیی ئاڵۆزە، لە زەوی پەیدا دەبێت وەك سووتەمەنی، یان ئاوێتەی کیمیایی بەکاردێت.

**٤٠٢- جيولوجية البترول** petroleum geology

**زەویزانیی ( جیۆلۆجیی ) پێترۆڵ**

ئەو بەشەی زەویزانییە، کە لە هەموو ئەو بابەتانە دەدوێ کە تایبەتە لە بنەڕەتی پێترۆڵ و پێکهاتنی و شوێنەکانی لە بەردەکانداو ڕێگەکانی دۆزینەوەی.

**٤٠٣- قبّةً ملحيَة إختراقيّة** piercement saltomdome

**گومەزە خوێینەیەکی سمراو ( سمۆك )**

گۆمەزە خوێینەیەکە، ناوکە خوێینەکەی، ئەو چینانەی ژوور خوێ دەسمێت تا دەگاتە ڕووەکەی یان لێی نزیك دەبێتەوە.

**٤٠٤- صدع محوري** pivotal fault

**تەوەرەە درزبردن**

درزێكی ئاساییە، هەردوو بارستەی بەردەكانی هەردوولای تێدا دەخولێتەوە بە دوو لای پێچەوانەی یەكتردا لەسەر تەوەرێكی نزیك ستوونی لەسەر ڕووەكە

**٤٠٥- التحرّف اللدن = التحرف المتبقی** plastic deformation

**شێوانی گونجۆك = شێوانی ماوە** residual deformation

(**بڕوانە :** deformation)

**٤٠٦- طبقات مثناة** plicated strata

**چینە پێچانەوە**

ئەو چینانەن، كە فرە لۆچی بچووك و لێكنزیكی و لاری گەورەن.

**٤٠٧- ملخ الطيّ** plicative dislocation

**ترازانی پێچانەوە ( لۆچ )**

دیمەنی پێكهاتەیی و دروستكارین لە بەرددا، بنچینەكەیان، پێچانەوەیە (لۆچكردنە) بە جووڵە زەمینییەكان.

**٤٠٨- لۆچی نقومكردن** plunging fold

لۆچێكە، تەوەری پێچانەوەكەی لە ئاستی ئاسۆییدا لاردەبێتەوەو لە ژێر زەویدا نقوم دەبێت.

**٤٠٩- مسامات، ثقـوب** pores

**كونیلەكان**

بۆشاییەكانی نێوان دەنكۆڵەكانی بەردە و ماوەكەی لە قەبارەیەكی دیاریكراوی بەرددا، بەستراوە بە پلەی خڕیی دەنكۆڵەكان و شێوازی ڕیزبوون و ئەو پەستاوتنەی بەردەكەی كەوتۆتە بەرلەكانی دروستبوونیەوە .

٤١٠- **مساميّة** porosity

**كونيلەداری**

**ڕەوشـتی بـوونی بۆشـاییە لـە نێـوان دەنكۆڵـەكانی بـەرددا و كونیلـەداری بـە دابەشـكردنی قـەبارەی گشـتیی بۆشـاییەكان بەسـەر قـەربارەی بەردەكـە خۆیـدا، لەگەڵ سەد لێك درابن دەدۆزرێتەوە.**

٤١١- **تنقيب** prospecting

**كنەكردن**

**گـەڕان و پشـكنینە بـە دوای خـاوە كانییەكانـدا، كـە دڵنیانـەبین لـەبوونی، یـان كنــەكردنی ســەرەتایی لــەو خاوەكانییانــە، كــە بوونیــان ســەلمێنراوە بــە دۆزینەوەیان**

# (R)

٤١٢- **صدوع شعاعيه** radial faults

**تیشکەدرز**

(أ) **کۆمەڵـە درزێکـن، لەسـەر نەخشـە وا دەردەکـەون کـە لـە چـەقێکی هاوبەشەوە تیشکی دابێتەوە**

(ب) **درزی لادانی سەرەکیی بەرزن**

٤١٣- **الطيّة المضطجعة** recumbent fold

**قەدی ( لۆچی ) ڕاکشاو**

**لۆچـێکە، لارییەکـەی زۆربـووە و نزیکـە ئاسـایی بـووە و سـەرێکی لـەوی تریـان بەرزتربووە.**

٤١٤- **الطّي المتكرّر** refolding

**لۆچی چەند بارەوەبوو**

**بەردە کۆنە شێواوەکان، کەوتوونەتە بەر جووڵەی لۆچبوونی نویێ کە بۆتـە هـۆی پەیدابوونی دوو کۆمەڵە، یان زۆرتر شێواویی جیاواز لە کۆنیدا.**

٤١٥- **نفوذية نسبيّة** relative permeability

**ڕێژە دادەری**

**ڕێـژەی دادانـی بـەردێکی کونیلـەدارە لـە بـارودۆخێکی دیـاریکراودا بـۆ دادەریـی پەتی (ڕەها)**

٤١٦- **فواصل التفسخ** release joints

**جمگـەکانی واز لێ هێنـان (بـەرەڵاکردن) ئـەو جمگانـەن، کـە لـە لـەڕزینی بـەرد پەیدادەبێت، بە هۆی ئەو پەستاوتنەوە کە کەوتۆتە سەری.**

٤١٧- **صدوع معكوس** reverse faults

**درزی پێچەوانە**

**درزبردنێکە، ڕووی درزەکە بەرەو لای نیشانی ژوورو لاردەبێتەوەو لە پەستاوتن پەیدا دەبێت.**

٤١٨- طيّة إنسياب معكوسة reverse flowage fold

لۆچی ڕەوینی پێچەوانە

لۆچێکە، چینە بەردەکانی لووتکەکەی ئەستوورو هی بنکەکەی تەنك دەبێت.

٤١٩- طيّة تشابه معكوسة reverse similar fold

لۆچی لێکچوونی پێچەوانە

٤٢٠- ترسّب نسقي rhythmic sedimentation

نیشتنی ڕێك و پێك

نیشتنێکی چەند بارەوەبووی چەند چینێکی بەرودوا ( یەك لە دوای یەك ) ە بەڕێك و پێکی.

٤٢١- نفط غني rich oil

نەوتی دەوڵەمەند

نەوتێکە، ڕێژەیەکی بەرز ( زۆر) لەو سووکە دڵۆپێنراوانەی تێدایە کە وەك سووتەمەنی بەکاردێن و ڕێژەیەکی کەم قورسە دڵۆپێنراوی تێدایە.

٤٢٢- صدوع الحيد( الحواف ) ridge faults

کەنارە درزەکان

درزەکان ڕاوەشاندن بە پێوەرێکی بچووك

٤٢٣- طيّة الحواف ridge fold

لۆچی کەنار

لۆچێکی هەردووسەر نوقمە ( نقومە) و گومەزی لاکێشەییە.

٤٢٤- صدوع الخسف rift fault

درزی قووڵ ،درزی داتە پیو

دوو درزی پێك تەریبن، یان دوو کۆمەڵ درزی پلە پلەن، بەردەکان لەناوخۆیاندا نزم دەبنەوە و چاڵێکی بە زۆری فراوان پێك دێنن.

٤٢٥- صدوع يميني جانبي right- lateral fault

ڕاستە درزی لاوەکی

خلیسکە درزێکی پیاکەوتەیە، جمگەیەکی ئاسۆیی ڕاستەی هەیە.

٤٢٦- قُعَيرة حافيّة rim- syncline

**کەنارە چاڵۆکە**

ئـەو لۆچـە دامێنییانـەن بـەرەو دەوری کـەناری گومـەزە خوێیینـەکان نەشـونما دەکات و باوەڕوایە کە لە دابەزینی چینەکان لە بۆشاییەکی خڕدا کە لە کۆچی خوێیەکە و دزەکردنی لە چینەکانی سەرچاوەکەوە پەیدا دەبێت.

٤٢٧- أداة حفر دوارة rotary

**ئامێری هەڵکەندنی خولاوە**

چەقۆیەکی هەڵکۆڵینـە، بـۆ وردکردنـی پێکهاتـە جیۆلۆجییـەکان بـە خولانـەوەی قوچەکی پۆڵا، یان پۆڵای بەکاربۆراندۆم موتوربەکراو.

٤٢٨- الحفر الرحويّ rotary drilling

**دەستارە هەڵکەندن**

دروستکردنی کونیلە، لە پێکهاتەیەکی جیۆلۆجیدا، بە بەکارهێنانی خولانەوە.

٤٢٩- حفارة رحويّة rotary drilling machine

**دەستارە هەڵکەنە**

مەکینەیەکـە، بـۆ سمینـی زەوی بـە هـۆی سـتوونێکەوە کـە زۆر خێـرا بـە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە قورسی، یان پەستاوتن.

٤٣٠- صدع دوّار rotary fault

**درزی خولانەوە**

درزێکـە، لـەکاتی درزبردنـدا، لایـەکی دەپێچـرێتەوە لـە چـاو لایەکـەی تریـدا، بـە جۆرێك ئەگەر وادابنێن دوو هێڵی پێك تەریبمان لـە هـەردوو لای درزەکە و دوور لەناوچەی هەڵکەندنەکە کێشابێ پێش درزبردن، پاش ئەوە پێك تەریب نابن.

٤٣١- نضد دوّار rotary table

**مێزی خولانەوە**

مێزێکــە، بەشــێکی دەبێــت لــە مەکینــەی هەڵکەندنــە خولاوەکــە و بــۆریی هەڵکەندنەکانی پێ دەچەسپێنرێت و دەیشی خولێنێتەوە.

٤٣٢- طيّ اسطوانيّ دوّار rotary cylinderoidal folding

لۆچی لوولەكیی خولانەوە

لۆچـێكی پاشـكۆیە ( دواتـرە)، ئاراسـتە تەوەرەییـەكانی لۆچـێكی لوولـەكیی پێشتر بێئەوەی ڕوخسارەكەی لەناوبەرێت ( بسڕێتەوە).

٤٣٣- صدع دوراني rotational fault

درزی خولانەوە

ئەو درزەیە، كە هەردوولای پێ دەجوولێن لە دەوری تەوەرێكی ستوونی لەسەر ئاراستەی جوولان.

# (S)

٤٣٤- سَرج ( في الجيولوجيا التركيبية ) saddle ( structural geology)

زين ( له جيۆلۆجیای پێکهاتەییدا )

پێکهاتەیەکە، لە دابەزینی پێکهاتوویەکی قۆقز، کە لە زین دەچێت پەیدا دەبێت.

٤٣٥- طيّة سرجيّة saddle fold

لۆچێکی زینی

جۆرە لۆچێکە لە شێوەی قۆقزییەکدا، لەسەر لووتکەکەی، لۆچێکی ناوەنجی هەڵگرتووە ئاراستەکەی ستوونییە لەسەر ئاراستەی لۆچە بنەڕەتییەکەی.

٤٣٦- برك الهبوط sag ponds

گۆمە داکەوتووەکان، گۆمە داتەپیوەکان

ئەو گۆمانەن، کە لەو نزمایيانەدا پەیدا دەبن کە لە دابەزینی بارستە بەردەکان پێك دیت، بە کاریگەریی درزەکاراکان.

٤٣٧- قباب الملح salt domes

گومەزی خوێ

پێکهاتەیەکە، لەبەردە نیشتووەکاندا، لە کاریگەریی پێکداچوونی چینە خوێ بەردینەکان (بەردە خوێیەکان) لەگەڵ گومەزە خوێیەکان و پاڵی پێوە دەنێت بۆ سەرەوە لە شێوەی گومەزدا، دەشێت گومەزە خوێیینەکان، بەردەکانی ژوور خۆیان بسمن، یان تەنیا لۆچیا دەکات.

گومەزە خوێیینەکان، پێکهاتەی گرنگن لە ڕووی ئابوورییەوە، چونکە تەڵە دروست دەکەن بۆ گلدانەوەی پێترۆڵ، هەروەك خوێ و گۆگردە تێکەڵبووەکەی.

٤٣٨- حنيرة مكشوطة sclaped anticline

زنجیرە تەنی داماڵراو

گومەزێکە، سەرەکەی بە هۆی هۆکارەکانی داماڵینەوە لابراوە، پێش نیشاندنی چینە نەگونجاوەکانی ژوورییەوە.

٤٣٩- صدع المقص = صدع المفصلة scissor fault = hinge fault

درزی مقەست = درزی جیاکەرە ( جیاکەرە درز )

درزێکی ئاساییە سەرەلادانەکەی بە ڕێکوپێکی زیاد دەکات، دوور لەو پنتەی تێیدا دروست بووە.

٤٤٠- طغيان البحر ( تقدم ) sea transgression ( advance)

هەڵسانی دەریا ( پێشکەوتن )

هەڵکشانی ئاوی دەریا بەرەو زەوی، لە ئەنجامی زۆربوونی ئاوی دەریا، یان داکشانی (داکەوتنی) زەوی.

٤٤١- تقعر عظيم من المرتبة الثانية second order geosyncline

چاڵێکی گەورەی پلە دوو

پێکهاتە نزمبوونەوەیەکی شوێنەکییە، بڕێکی دیاریکراو نیشتوو دەگرێت.

٤٤٢- نَزّ seepage

درزەکاری ( دزەکردن )

دیاردەی دزەکردنی نەوتە بۆ سەر ڕووی زەوی و پێکهێنانی سەرچاوەیەکی پێترۆڵی یان پەڵە ڕۆنی ( نەوتی) گەورە، کە نیشانەی بوونی نەوتی خاوە لەو ناوچەیەدا.

٤٤٣- مرسمة الزلازل ( سيزموجراف ) seismograph

بوومەلەرزەکێش ( سیزمۆگراف )

ئامێرێکە، شەپۆلە بوومەلەرزەییەکان تۆماردەکات وهاوواتای (detector) ە.

٤٤٤- زلازلي – سيزمولوجي seismologist

سیزمۆلۆجیست ( بوومەلەزرەزان )

ئەو کەسەیە، کە کار بە یاساکانی بوومەلەزرە دەکات لە کاروباریدا وەك دۆزینەوەی پێترۆڵ و بوومەلەرزەوشتی تریش.

٤٤٥- علم الزلازل – سيزمولوجيا seismology

بومەلەرزەزانی - سیزمۆلۆجیا

ئەو زانستەیە، کە تایبەتە بە خوێندنی بوومەلەرزەو هەموو پێوەندیدارەکانی، وەك هێز و مەودا و هێڵەکانی ئاراستەو کاتەکانی و ڕەوشی تریش وشیکردنەوەی داتاکان (زانیارییەکان) .

٤٤٦- مقياس الزلزلة – سيزموميتر seismometer

بوومەلەرزە پێو – سیزمۆمیتەر

ئـامێرێکی دۆزینەوەیـە، ترپـە بوومەلەرزەییـەکان وەردەگرێـت و ئاسـایی بـۆ دۆزینـــــەوەی بوومەلـــــەرزەی سروشـــــتی بـــــەکاردێت و هاوواتــــــای ( geophone,pick-up , detector )ە.

٤٤٧- طيّة جز shear fold = slip fold

خزینە لۆچ

لۆچێکە، لـە وردە خزینـی چینەکان لەسـەر ئاسـتەکانی شـکان، یـان درزە لێـک نزیکەکان پێك دێت.

٤٤٨- بنيات لوحيّة shear structure

دە پە دروستکەرەکان

ڕێڕەوی وردە بەردی بە شێوەی دە پێ تەریب بۆ درزێکی نزیکی درزەکەیە.

٤٤٩- طرف قصير short limb

پەلی کورت

ئەو ناوپەلە ناچونیەکەی لۆچە، کە ئەوەندەی پێ ناچێت ئاراستەکەی پێچەوانە دەبێتەوە و بە زۆری پەلە لاداو ترەکە دەبێت.

٤٥٠- الطيّات الخطيّة السجمية sigmoidal linear folds

هێڵە لۆچە سیگمۆیدییەکان

( بڕوانـە : linear folds ) ئـەو چـەماوانەن کەشـێوەکەی پێچاو پێچـە ( وەك تیپـی s )وایە.

٤٥١- الطيّ المتماثل similar folding

لێکچووە لۆچ

ئەو لۆچەیە، کـە هەرچینێکی هـەمان ئـەو شـێوە ئەندازەییـەی چینەکەی ژووری خۆی دەگرێـت و لـەم جـۆرە لۆچبوونەدا، تـەنکبوونی چینەکانی پـەلی ( سـەری) لۆچەکان و ئەستووربوونی تەوەرەکانی لێ پێك دێت.

٤٥٢- عربة نقل معلقة sky hook

عەرەبانەی گواستنەوەی هەڵواسراو

ئەو عەرەبانەی گواستنەوانەن کە بەسەر تەلی هەواییدا دەجووڵێن و خاوەکانیان پێ دەگوێزرێتەوە.

٤٥٣- مصاقل slickensides

لووسکراوەکان

ئەو ڕووی بەردانەیە، کە بەهۆی درزبردن و بەسەریەکدا خزانی چینەکانەوە ساف بوون وئاراستەی جووڵانەکەیان لەسەرەوە دەردەکەوێت.

٤٥٤- صقل slickensiding

لووسکردن، ساف کردن

دیوارە ڕووشاندنێکی درزە، لە ئەنجامی لێکخشان بە جووڵە و ئەو پەستاوتن و گەرمییەدا لە لەگەڵیدا دەبێت پەیدا دەبێت.

٤٥٥- الطيّ الانزلاقــي slip folding

خزە لۆچبوون

پەیدابوونی لۆچە لە چینەکاندا، بە خزان نەك چرچبوونی ڕاستەقینە.

٤٥٦- زحفة الصدع slip of the fault

خشانی درز

ئەو ماوە ڕاستەقینەیەیە، کە لە ئاستی درزەکەدا چینەکان لای دەدات.

٤٥٧- سقاَطة sludge

ملتە، لیتە

قوڕ و پیێو، یان هەر ماددەیەکی تری خەست.

٤٥٨- بَرَد صغير small hail

وردە تەرزە

دڵۆپە ئاوی بەستووی نیوە ڕوونی خڕە، دەشێ قووچەکی و تیرەکەی لە نێوان ٢ تا ٥ مم بێت و کە ئاسایی لە ناوکێکی تەرزەی نەرم پێك دێت، کە بە تەنکە چینێکی سەهۆڵی ڕوون داپۆشراوە و زۆرتر لەگەڵ باران دەبارێت نەك لەگەڵ بەفر.

٤٥٩- بَرَد ليّن soft hail

**نەرمە تەرزە**

دەنکە تەرزەی سپیی نارۆشنن، تیرەکەی لە نێوان ٢ تا ٥ مم دەبێت و لە بەفر دەچێت، پێش کەوتنەزەویی بەفر، یان لەگەڵیدا دەکەوێتە سەر زەوی.

٤٦٠- صدوع درجية step fault

**درزە پلە پلەکان**

درزی ئاسایی، یان پێچەوانەیە بە رودواو تەریب درێژدەبێتەوە، بە جۆرێك چینەکانی بەردە درێژەوەبووەکان، دەردەکەون، کە وەك پلەکانی پەیژە بە بەرودواو پلەپلەن.

٤٦١- خط مناسيب بنيوى مجسّم stereo structural contour

**ئاستە هێڵی دروستکەری بەرجەستە**

ئاستە ( کۆنتۆرە) هێڵێکی پێکهێنییە و بە دووربینی بەرجەستە لەوێنە هەواییەکانەوە دیاری دەکرێت.

٤٦٢- صدع المتجّه strike fault

**ئاراستەدرز**

درزێکە، تەریب بە درێژایی چینە درزبردووەکان، درێژدەبێتەوە.

٤٦٣- فاصل مُتجَّهَي strike joint

**ئاراستە جمگە**

جمگەیەکە، ئاراستە بەرکەوتەکەی ، لەگەڵ ئاراستە بەرکەوتەی چینەکان تەریب دەبن.

٤٦٤- الازاحة المتجهيّة strike shift

بەرەنجامی ئاسۆیی لادانە، بە ئاراستەی تەریبی بەرکەوتەی درز دەپێورێت.

٤٦٥- خط مناسب بنيوي structural contour

**دروستکەرە ئاستەهێڵ**

هێڵێکی ئەندێشەییە، بەرزاییە یەکسانەکانی سەر ئاستێکی چینەکیی دەستە بژێر پیشان دەدات و پێی دەڵێن بنچینە هێڵی پێکهێنی.

**٤٦٦- خريطة المناسيب البنيوية** structural contour map

**نەخشەی ئاستە دروستکارەکان**

**نەخشەیەکە، سروشتی پێکهاتەی دروستکاری بەردە ئاستێکی دیاریکراو ڕوون دەکاتەوە لە ژێر زەویدا و نەخشەکە، لە چەند ئاستە هێڵێك پێك دێت،کە هەریەکەیان ئاستە یەکسانەکانی ئەم ئاقارە بەردییەی ژێر دەریا، دەگەیێنیت بەیەك .**

**٤٦٧- مَرْفَع بنيوي** structural high

**بەبەشە بەرزییەکانی گومەزە پێکهێنییەکان، یان قۆقزە پێکهێنییەکانی تر دەوترێت.**

**٤٦٨- طبقات تحت سطحية** subsurface beds

**چینە ژێر ڕووییەکان**

**ئەو چینە بەردینانەی ژێر ڕووی زەوین لە شوێنێکدا.**

**٤٦٩- الجيولوجيا تحت السطحية** subsurface geology

**ژێر ڕووە زەویزانی**

**ئەو لقەی زەویزانییە، کە لەو بەشەی بەردەکانی توێکڵی زەوی کەلە سەر زەوییەوە دەرناکەوێت دەکۆڵێتەوە، بەپەنابردنە بەر سروشتە زەویزانی ( جیۆفیزیك) یان بیرهەڵکەندن.**

**٤٧٠- ماء ملح تحت سطحي** subsurface salt water

**ژێر ڕووە خوێئاو،سوێراوێکە لە ژێر زەویدا**

**٤٧١- طيّة مترققة** subratenuous fold

**لۆچی تەنکێنراو**

**لۆچێکە، لەکاتی نیشتنی بەردەکاندا پەیدادەبێت و چینەکانی لەو پەڕی تەنکیدا دەبن لە لووتکەی قۆقزییەکان و لەو پەڕی ئەستووریشدا دەبن لە بنکی چاڵەکاندا.**

٤٧٢- طيّة مقعّرة syncline

چاڵە لۆچ

لۆچێکە، باڵەکانی بۆ سەرەوە دەبن.

٤٧٣- قُعيرة مركبـة synclinorium

چاڵۆکەی ئاوێتە

چـاڵێکی قـەبارە گـەورە و زۆر درێـژەوەبووە و لەچـەند لۆچـێکی چـاڵ کـە پێچەوانەی قۆقزییە پێك دێت.

# (T)

٤٧٤- التيارات الأرضية telluric currents

زەمینە تەزووەکان

تەزووی کارەبایی سروشتین، بەناو بەردە بەرگەکەی توێکڵی زەویدا دەڕەوێت، کە بنەڕەتەکەی لە خۆرەوەیە، لەبەرکەوتنی کارەباییدا لەو قووڵاییانەدا کە ۲۰۰۰ مەتر زۆرترن، و ناتوانرێ ڕێگە دەستکردەکانی بەرکەوتنی کارەبایی بەکاربهێنرێت، سوودیان لێ وەردەگیرێت.

٤٧٥- ثخانة( سمك ) الطبقة thickness of bed

ئەستووریی چین

چینێکی کەم دوورییە لە نێوان دووڕووەکەیدا.

٤٧٦- تَرقُّق الطبقة thinning of bed

تەنکبوونی چین

وردە وردە کەمبوونەوەی ئەستووریی چینەکەیە، لەگەڵ درێژبوونەوەی بەلایەکی ئاسۆیی دیاریکراودا.

٤٧٧- رَمْيَة الصدع throw of fault

فرێدانی درز

ماوەی لادانی سەرەکیی چینەکانی هەردوولای درزێکە، کە لە خلیسکانی بەردەکان بەسەر ڕووەکەیدا پەیدا دەبێت.

٤٧٨- صدع الدسر thrust fault

درزی پێداکردن

درزێکە، لە پەستانێکی توندی ئەوتۆ پەیدادەبێت، کە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی دیوارە هەڵواسراوەکە، لەچاو دیوارەکەی خوارووددا.

tight fault **٤٧٩- طيّة محكمة**

**توند پێچانەوە، لۆچی توند**

قەدکردن ( پێچانەوە)یەکە، تینی شێوانەکەی دەگاتە ڕاددەیەك، کە دەبێتە هۆی ڕەوینی بەردە لاوازەکان، تەنانەت چینەکانیان ئەستوور تردەبن لە هەندێ شوێن و لە هەندێ شوێنی تریشدا، تەنك دەبن.

tilt blocks **٤٨٠- الكتل المائلة**

**بارستە لارەکان**

بارستە بەردێکە لە ڕوودانی درزی دیار کە پەستانێکە بخرێتە سەر لایەکی زۆرتر لەوەی لایەکەی تر وەردەگرێت و دەبێتە هۆی لارییەکەی.

topographic low **٤٨١- مخفض طوبوغراف**

**نشێویی تۆپۆگرافیایی**

زاراوێکە، بە زۆری لە نەوتەلأنەکاندا بەکاردەهێنرێت و واتای ئاستە نزمەکان دەگەیێنێت، بێ گوێدانە تەمەنی جیۆلۆجیی بەردەکان.

topographic high **٤٨٢- مرتفع طوبوغرافي**

**بەرزایی تۆپۆگرافیایی**

زاراوێکە، بە زۆری لە نەوتەلأنەکاندا بەکاردەهێنرێت و واتای ئاستە بەرزەکان دەگەیێنیت، بێ گوێدانە تەمەنی جیۆلۆجیی بەردەکان.

total field **٤٨٣- المجال الكلي**

**بواری گشتی**

کۆی گشتیی پێکهێنەکانی بوارە لێکۆڵراوەکەیە، وەك کایەی موگناتیسی و کایەی ڕاکێشان

total intensity **٤٨٤- الشدة الكلية**

**تینی گشتی**

(بڕوانە : کایەی گشتی)

**٤٨٥- تصحيح الزمن الكلّي** total time correction

**ڕاستكردنەوەی كاتی گشتی**

**زاراوێكە، لە كنەو پشكنین بەڕێگەی لە ڕزەیی ( سیزمی) دا بەكاردێت و بە كۆی ئەو ڕاستكارییانە دەڵێن كە بەسەر كاتی پێویست ڕۆیشتنی شەپۆلە پەڕچێنراوەكان كاری پێ دەكرێت، بۆ دیاریكردنی كات، كە درابێتە پاڵ ئاستێكی سەرچاوەیی هەڵبژاردە.**

**٤٨٦- ميزان اللّي** torsion balance

**تەرازووی چەوتاندنەوە ( چەماندنەوە )**

**ئامێرێكە، بۆ پێوانی هێزەكایەییەكان، بە ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە كایەی پێوراو بە هێزێكی تری زانراو و تەرازووی چەماندنەوە، هێزی بچووكی وەك هێزەكانی ڕاكێشانی زەوی و ڕاكێشانی موگناتیسی و هێزەكانی كایەی كارەبایی، بە دیاریكردنی بڕی ئەو چەمینەوەیەی هێزە پێوراوەكە بەسەر تەلێكی زۆر باریكیدا دێنێت.**

**٤٨٧- معامل اللي** torsion coefficient

**هاوكۆلكەی چەماندنەوە**

**پێوانی بەرگریی ماددەیەكە، لە پەستاوتنێكی چەماندنەوەیی، كە بە تیپی (ت) هێما دەكرێت و دەكاتە (ط ص نق ٤ ل) بۆ تەلێكی لوولەكیی نیوەتیرە (نق ) و درێژی (ل) و هاوكۆلكەی سەختییەكەی (ص) ە بە پێوەری سەنتیمەتر گرام – چركە و بەوەیش هاوكۆلكەی چەمینەوە دوورییەكانی ئیش (كار) وەردەگرێت و دەتوانین وا پێناسەی بكەین كە: بڕی كاری پێویستە بۆ چەماندنەوەی تەلەكە، بەدەوری گۆشەیەكی نیوەتیرەییدا.**

**٤٨٨- أس اللّي** torsion head

**سەری چەماندنەوە**

**(أ) ئەو بەشەی تەرازووی چەماندنەوەیە، كە تەل، یان داوەكەی پێدا شۆڕبۆتەوە.**

(ب) سەرقاپێکی خولانەوەی پلەکراوە لە لووتکەی بۆریی سەرەکیی تەرازووی چەماندنەوە هەڵگراوە.

٤٨٩- مُدّة اللي torsion period

ماوەی لەرینەوەی سروشتیی کۆمەڵە هەڵواسراوەکەی تەرازووی چەماندنەوە.

٤٩٠- سلك اللّي torsion wire

تەلی چەماندنەوە

تەلێکە، کۆمەکی شانی تەرازووی چەماندنەوە، یان ڕاکێشانپێو دەکات.

٤٩١- طغيان ( تقدّم البحر ) transgression = ( sea advance)

هەڵچوون ( پێشکەوتنی دەریا ) بەرەووشکایی، واتە بەرزبوونەوەی ئاستی بەستوونی و پێشکەوتنی بەئاسۆیی

(بڕوانە : sea transgression, advance)

٤٩٢- صدع مستعرض

transverse fault heave fault, tear fault , trans current fault

ئەو درزەیە، کەهەردوولایەکەی ئاسۆییانە پێی دەجوولێن،پاڵپێوەنانی سەرەکی و تەنیشتی سەرکەوتوو دابەزیویشی نییە، بەلاّم ماوەیەکی (لادانی ئاسۆیی) هەیە، ڕەنگە کورت ببێتەوە بۆ لە سانتیمەرێك کەمتر و دەشێت درێژببێتەوە بۆ هەزاران مەتر (هەروەك ئەو درزی فراوانکەر و درزی دڕێن و درزی دەرکەریشە).

٤٩٣- موجة مستعرضة transverse wave

پانە شەپۆل

١- جووڵەیەکی لەراوەیە، جووڵەی تەنکۆڵەکان تێیدا ستوونییە لەسەر ئاراستەی پێشکەوتنی شەمەندەفەری شەپۆلەکان.

٢- شەپۆلە جووڵەیەکی لەراوەیە ( سیزمییە) بە هۆی گوێزرانەوەی وردکەری بارستە بەردییەکانەوە.

٤٩٤- مصيدة trap

تەڵە ( داو )

بەردی کونیلەداری بە بەردی دانەدەر، یان پێکهاتەیەکی جیۆلۆجیی گونجاو دەورەدراوە، کە دەبێتە هۆی ڕەوینی نەوت و گازو ئاوو گلدانەوەی بە شێوەی گەنجینەی سروشتی.

٤٩٥- صدوع الغور trough fault

درزەکانی تەنکاو ئەو درزانەن، کە هەندێکیان بەلای یەکتردا لاردەبنەوە بە جۆرێك بەردەکان لەناوخۆیاندا نزم دەبنەوە بە شێوەی مۆژ، یان فنجانێکی گەورە.

٤٩٦- الثخانة( السمك ) الحقيقية للطبقة true thickness of bed

ئەستووریی ڕاستەقینەی چین،

کورتترین دووریی نێوان دوو ڕووی چینەکەیە.

٤٩٧- حَفَر عَنَفي turbo drilling

زەبرە هەڵکەندن ( تۆربینی )

جۆرە هەڵکەندنێکی خولاوەیە، تۆربینێکی لەسەری خوارووی بۆرییەکانی هەڵکەندن چەسپکراو، چەقۆی هەڵکەندن، لوولەکی کرۆك دەخاتە گەڕو دەست دەکات بە هەڵکەندنی ئەو پێکهاتە جیۆلۆجییانەی دێنە ڕێی بە هۆی ئەو جووڵەیەوە و تۆربینەکە خۆیشی لە ڕێی شلی هەڵکەندنەکەی ناو بۆرییەکانی هەڵکەندنەوە دەگەڕێت.

٤٩٨- حفارة عنفية ( تربينية ) turbo drilling machine

زەبرە هەڵکەن ( تۆربینی*

مەکینەیەکە، تۆربینەکە لە هەڵکەندندا بەکاردێنێت.

# (U)

underground storage (natural gas) ٤٩٩- **خزن جوفي ( غاز طبيعي )**

**ناخه هەڵگرتن ( گازی سروشتی )**

بەكارهێنانی گەنجینەی ژێر زەوییە بۆ كۆكردنەوەی گازی سروشتیی لە گازەڵانەكانیەوە هێنرا بۆ مەبەستە سەرەتاییەكانی هەڵگرتن و پاراستنی و دەتوانرێت تەنكەری ئاو، یان كۆگەیەكی هەر ماددەیەكی تر بەكاربهێنرێت و سوودی لێ وەردەگیرێت لە ئاسانكارییەكانی تەواو بەكارهێنانی هێڵە بۆرییەكان و بە ئاسانی گەیاندنیە بازاڕ.

up stream ٥٠٠- **مقدم التيار، أعالي النهر**

**پێشینەی تەوژم، بەرزاییەكانی ڕووبار**

زاراوێكە، باسی قۆناغە نزیك پنتە سەرەتاییەكانی پێ دەكرێت لە نەوتسازیدا.

up- throw of a fault ٥٠١- **رفعة الصدع**

**بەرزبوونەوەی درز**

ماوەی دەرپەڕینی بەردە بۆسەرەوە، كە درز دەبات .

uplifted side ٥٠٢- **الجانب المرفوع**

ئەو بەردەیە، كە وادەردەكەوێت لە لایەكی درزەكەوە سەردەكەوێت.

# (V)

**٥٠٣- مقياس فاكييه للمغنطيسية** vacquieer magnetometer

**موگناتیسێتیپێوی ڤاكیێ**

ئامێرێكە، بۆ پێوانی موگناتیسێتی و لە بنچینەدا، لە فڕۆكەدا بەكاردێت و گۆڕانی كایەی موگناتیسێتیی گشتی تۆماردەكرێت بێ گوێدانە گۆڕانی ئاقارەكەی و بەناوی ( ڤاكییێ) ی زاناوە ناونراوە.

**٥٠٤- مقياس التغيّر – فاريومتر** variometer

**گۆڕانپێو – ڤاریۆمیتەر**

١- ئامێرێكە بۆ پێوان و تۆماركردنی جیاوازییەكانی موگناتیسێتیی زەوی.

٢- ئامێرێكی پێوانەدارە، كە هاندانی گۆڕۆكێ تێدا بەكاردێت و بڕی گۆڕانەكەی پێ دەپێورێت.

**٥٠٥- تقطع السرعة** velocity discontinuity

**پچڕانی خێرایی**

گۆڕانێكی كتوپڕی خێرایی گوێزرانەوەی شەپۆلە سیزمییەكانە لەناخی زەویدا، وەك لەسەر ڕووی جیاكەرەوەی نێوان دوو چینە بەرددا ڕوودەدات.

**٥٠٦- سرعة الإنتشار** velocity of propagation

**خێرایی بڵاوبوونەوە**

ئەو خێراییەیە كە وزەی لەناوەندێكی دیاریكراودا پێ دەگوێزرێتەوە، وەك خێرایی بڵاوبوونەوەی شەپۆلەكان و خێرایی شەپۆلێك لە پنتێكی دیاریكراودا بەو خێراییە دەقەبڵێنرێت، كە سەرەتای ئەو شەپۆلە لەو پنتە دەپەڕێتەوە.

**٥٠٧- قطاع السرعة** velocity profile

**ڕوخساری خێرایی**

بڵاوبوونەوەیەكی بوومەلەرزەیی پێچەوانەیە كە بۆیە ڕوویداوە تاكو ئەو

ئەنجامانەی تۆماربکرێت کەبۆ دۆزینەوەی تێکڕای خێراییەکانی لە زەویدا بەکاردێت، ئەویش بە تێبینی گۆڕانی کات ، بەبەراورد لەگەڵ ڕێڕەوی ئەندازەیی تیشکە دەرپەڕیوەکە.

۵۰۸- میزان رأسي vertical balance

تەرازووی سەرەکی

ئامێرێکە، بۆ پێوانی جیاوازییەکانی پێکهاتەی سەرەکیی کایەی موگناتیسێتیی زەوی و ئەویش بەهاوسەنگیی زەبری چەماندنەوەی تایبەتیی سیستمێکی موگناتیسی بە بەکارهێنانی زەبری دژە چەماندنەوەیەك کە پشت بە ڕاکێشانی زەوی دەبەستێ و پێشی دەڵێن تەرازووی کایەی سەرەکی.

۵۰۹- صدع عادي رأسي vertical normal fault

درزێکی ئاسایی سەرەکی

۵۱۰- الثخانة الرأسية للطبقة vertical thickness of bed

ئەستووریی سەرەکیی چین

درێژی ئەو هێڵە سەرەکییەیەی، نێوان هەردوو ڕووی چینەلارەکەیە و لەگەڵ زۆربوونی لاریی چینەکە، درێژتر دەبێت، هەروەك لەگەڵ کەمکردنی لارییەکەی، کەم دەکات، تاکو هاوتای ئەستووریی ڕاستەقینە دەبێت ئەگەر چینەکە ئاسۆیی بێت.

۵۱۱- مقياس الجاذبية بالذبذبة vibration gravimeter

بەلەرینەوە ڕاکێشانپێو

ئامێرێکە، بۆ پێوانی ڕاکیشانی زەوی بەکاردێت، بەتایبەتی لە دەریاکاندا، ئەویش بە تێبینیی ماوەی پانە لەرینەوەی تەلێکی باریك کە بەستراوە بە قورساییەکی کێش زانراوەوە.

# (W)

٥١٢- **إفاضة بالماء، فيضان الماء** water flooding

**ئاوەزۆرکاری، لافاو، لێشاوی ئاو**

ڕێگەیەکی ناوەنجییە بۆ سوود وەرگرتن لە ڕۆنی نەوت، ئاودەکرێتە گەنجینەیەکی زەمینیی نەوتەوە، تاکو ئاوەکە شوێنی نەوتەکە بگرێتەوە و سەرئاوەکە بکەوێت لە بیری سوود لێ وەرگرتنەکەدا.

٥١٣- **الحقن بالماء** **ئاوتێکردن** water injection

**الافاضة بالماء** **ئاوەزۆرکاری** =water flooding

کردەی دووەم دەرهێنانی نەوتە، کە ئاو دەکرێتە گەنجینە نەوتەکانەوە تاکو نەوتەکە سەرئاو بکەوێت.

٥١٤- **سجل البئر** well log

**تۆماری بیرەکە**

بیر تۆمارکردنێکی بەردینە بەزۆری واچینە سمراوەکان پیشان دەدەن هەروەك دەشێت جیۆلۆجی، یان جیۆفیزیکی، یان جیۆ کیمیایی بێت.

٥١٥- **عينة بئرية** well sample

**بیرە نموونەیەك**

پارچە بەردێکە، لە بیر هەڵکەندن پەیدا دەبێت، لەگەڵ پارچە بەردی وەك خۆی کۆدەکرێتەوە و دەپارێزرێن، بۆ ناسینەوەی جۆری ئەو بەردانەی کونەکەیان پێدا تێ دەپەڕێت.

٥١٦-**توزيع الآبار** well spacing

**دابەشکردنی بیرەکان**

جوگرافیاییە دابەشکردنی شوێنی بیرەکان لەسەر ڕووی زەوی لەسەر گەنجییەیەکی سروشتیی ئاو، یان نەوت، یان خاوەکانەکان، بە دیاریکردنی ماوەی ( دووریی ) نێوان ئەو بیرانە.

٥١٧- ربط الآبار well tying

**پێکەوە بەستنی بیرەکان**

بەستنەوەو بەراوردکردنی، سیزمە بەهایەکی دۆزراوە بە جیۆلۆجییە بەهایەکی پێشبینیکراو لە شوێنی بیرەکاندا، تاکو ڕاددەی ڕاستیی لەرزە نەخشە، یان (سیزمی).

٥١٨- تشكّل فينـر wenner configuration

**بار ڕێکخستنی ڤینەر**

ڕیزکردنێکە دەدرێتە پاڵ دانەرە ئەڵەمانییەکەی ( ڤینەر)،کە بۆ دروستکردنی پانە بڕگە بەکاردێت و لە قووڵاییشدا بە یەکێك لە ڕێگەکانی بەرگریی ئەو تەزووە بەردەوامەی چوار جەمسەری کارەبایی لە سەر هێڵێك و هاو دووری بەکاردێت و تەزووەکە بەناو دوو جەمسەرە دەرەکییەکاندا تێپەڕدەکرێت و جیاوازیی ئەرك لە نێوان دوو جەمسەرە ناوەکییەکاندا دەدۆزرێتەوە و ڕەنگە ئەو ڕیزکردنە بە ئاقارێکی ڕاست و بە ماوەی یەکسان لە نێوان جەمسەرەکاندا بگوێزرێتەوە.

بۆ دەست کەوتنی پانە بڕگەیەك و دەشێ وردە وردە لەناوەندەوە بۆ دەرەوە بجووڵێنرێت، بۆ دەستخستنی بڕگەیەك لە قووڵاییدا.

٥١٩- بئر كشف عشوائية wildcat well

**بیری دۆزینەوەی کوێرانە**

ئەو بیرەیە، کە بێ خوێندنێکی زانستی لە پێکهاتەیەکی جیۆلۆجیی هێشتا سوود لێ وەرنەگیراودا هەڵدەکەندرێت.

٥٢٠- كشف عشوائي wildcatting

**دۆزینەوەی کوێرانە**

گەڕان و پشکنین و بیرەنەوت لێدان، بەبێ گوێدانە بەهازانستییەکان.

## (X)

**٥٢١-نسيج ( حُبيبي ) عدم الأوجه** xenomorphic ( granular) texture

**ڕستێکی ( دەنکۆڵەیی ) بێڕەنگ**

( **بڕوانە** {allotropic (granular) texture} )

## (Z)

**٥٢٢- ز ( جیۆفیزیا )** Z ( geophysics )

**ئەم تیپە لە زانستی سروشتی زەوی ( جیۆفیزیک)دا بەکاردێت بۆ ئەوەی قوولاّییەك لە ژێر ئاستێکی دیاریکراو پیشان بدات.**

**٥٢٣- زیولیت= زیۆلایت** Zeolite $Na_2O.\ Al_2O_3.\ nSiO_2.\ \times H_2O$

**زاراوێکی گشتییە، بە کۆمەڵەکانێکی پێکهێن دەوترێت کە ئاوەسلیکاتی ئەلومنیۆمی سۆدیۆم و کالیسیۆم و باریۆم وسترونتیۆم و پۆتاسیۆمە، بەئاسان ونکردنی و وەرگرتنی ، جیادەکرێتەوە و ئەگەر بدرێتە بەرگەرمییەکی بەرز هەڵدەئاوسێت، زۆریان بە توانستی زۆری لەسەر ئایۆنگۆڕکێ جیادەکرێتەوە.**

**٥٢٤- طيّة متعرجـة** zigzag fold

**لۆچی پێچاوپێچ**

( **بڕوانە :** chevron fold )

**٥٢٥- نطاق** zone

**بوار، پشتێنە**

**ئەو بەشە بەردییەی ستوونی جیۆلۆجییە، کە لە کاتی دەمی کاتی جیۆلۆجیدا نیشتووە و بە بوونی بەردینە، یان کۆمەڵێك جۆرەگیانەوەر، یان ڕووەك، کەلێی تێ ناپەڕێ بۆ بوارێکی تر.**

**٥٢٦- تنطيـق** zoning

**بواراندن**

**ئاشنابوون بەو بوارانەی لە بابەتێکی بەردیدا هەن، یان پۆلاندنی چین بۆ بوار.**

# زاراوەکانی کیمیای نەوت

## ( A )

١ - جيهاز ايبل ( لقياس نقطة الوميض ) Abel for flash point

ئامێری ئێبڵ ( بۆ پێوانی پنتی درەوشەدانەوە )

ئامێرێکە، ڕۆنی تێدا گەرم دەکرێت و هەڵمەکەی دەدرێتە بەر گرێك، لەکاتی گڕگرتنیدا پلەی گەرمیی دەپێورێت، ((ئێبل)) دای هێناوە.

٢- زيت الإمتصاص absorption oil

ڕۆنی مژین

ئەوڕۆنەی لەمژینی گازوشلە فڕۆکەکاندا بە کاردەهێنرێت.

٣- تسارع Acceleration

تاودان

گۆڕانی خێرایی کارلێکێکی کیمیاییە بەهۆی کارتێکەرێکی دەرەکییەوە وەك پلەی گەرمی، یان پەستان، یان ماددەیەکی هاندەر ٠

٤- مركم accumulator

کۆکەرەوە

(١) ئامێرێکە، بۆ کۆکردنەوەی (هەڵگرتنی) کارەبا، کەپشت بە کارلێکێکی کیمیایی پێچەوانە دەبەستێ، وەك کارەباکۆکەرەی قوڕقوشم ٠

(٢) ئامێرێکە بۆهەڵگرتنی هەڵم، کە هەڵمەکە لە دەفرێکی وەك کوڵێن لەژێر پەستاندا کۆ دەبێتەوە و لەگەڵ ئاوەگەرمەکە بەریەك دەکەون.

٥- أنهيدريد أسيتيك – أنهيدريد الخليك acetic drideanhy

ئەنهایدرایدی ئەسیتی – ئەنهایدراید ی سرکە

ئاوێتەیەکی ئەندا مییە، لەکاربۆن و هایدرۆجین وئۆکسجین بەوەرگرتەیەکی دووگەرد ترشی سرکە، پاش لێ دەرهێنانی گەردێك ئاو، دادەنرێت و شلێکی بۆنتیژە وشێوگی کیمیاییەکەی ($C_4H_6O_3$) یە.

acetone = dimethyl etonek ٦- أسيتون = ثنائي مثيل كيتون

ئەسیتۆن = دوانە مەثیل کیتۆن

ئاوێتەیەکی ئەندامییە، لەکاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین پێك دێت، شێوگە کیمیاییەکەی ($C_4H_6O$)یە.

acid gas ٧- غاز حامض

ترشە گاز

ئەوگازەیە، کەکارێکی ترشانەی هەیە، وەك گازی دوانۆکسیدی کاربۆن و دوانۆکسیدی گۆگردو هی تریش.

acidification ٨- تحميض

ترشکردن

پێپەیداکردنی ڕەوشتی ترشێتی بەماددە یەك، بەتێکردنی ترشێك لەماددە کە.

actual plant results ٩- نتا ئج المصنع الفعلية

بەرهەمی کردەیی شوێنکار

ئەو بەرهەمانەن، کە بەکارپێکردنی کردەیی لە شوێنکارێکدا دەستمان دەکەون.

additive ١٠- اضافات

تێکراوەکان

ئەو ماددانەن کە بەڕێژەی کەم دەکرێنە هەندێ پێکهێنی سەرەکییەوە، بۆچاکسازیی ڕەوشتی ماددە بنچینەییەکان، یان هەوڵی چەسپاندنیان، وەك تێکردنی چوارە ئە ثیلی قوڕقوشم لە بەنزینی ئۆتۆمۆبیل بۆ بەرزکرنەوەی ئۆکتانە ژمارەکەی.

aeruted oils ١١- زيوت مُهواة

هەوادارکردنی ڕۆنەکان

ئەو ڕۆنانەن، کەهەوا، یان هەرگازێکی چالاکیان پێدا دەبریت، بۆ لابردنی هەندێ گاز، یان ماددەی فڕۆکی نە خوازراو.

**١٢- إسطوانات ترذ يذ** aerosol bombs

**لوولەکەکانی دوکەلاًندن**

لووله کێکه پڕ دەکرێت لەشلێك و گازێك دەپەستێورێته ناویەوە و که دەمەکەی دەپەستێورێت، شلەکەی بەشێوەی پرژەڵی دەردە پەڕێت لە ژێر پەستاوتنی گازە ناوە کییە کەدا.

**١٣- جیهازتنقیة الخام بالهوا ء والنشاد ر** air – ammonia sweetning plant

ئامێری خاوێنکردنی خاو، بە هەواو نەوشاتر (ئەمۆنیا) لابردنی خەوش و ترشە گازەکان بەهۆی هەواو ئەمۆنیاوە.

**١٤- وحدة تکثیف بتبریدالهوا ء** air cooled condensing unit

**بەشی خەستکردنەوە بەساردکردنەوەی هەوا**

بەشێکە لەئامێرەکان، کەهەڵمە گەرمەکانی تێدا خەست دەکرێتەوە، بەتەوژمە هەوایەکی سارد کە بەپێچەوانەی ئاراستەی هەڵمەکانەوە دەڕوات.

**١٥- مســد س هوائي للتـشحیم** air motor grease gun

**بادەمانچەی چەورکردن**

ئامێرێکە، لەدەمانچە دەچێت، ڕۆنی چەور کرد نە کەی تێدا، لەژێر پەستانی هەوادا پاڵ پێوەدە نرێت لە چەور کەرەی بزوێن و ئامێرەکاندا.

**١٦- ذبالة الهواء** air wick

**پلیتەی هەوا**

شریتێکی کوتاڵ (قوماش) یان داوی هۆنراوەن، لە دەفرێکی بچووکدا دادەنرێن کە هەندێ لەو شلە تایبەتانەی تێدایە کە درەنگ دەهەڵمن لەڕێی شریتەکەوە و یارمەتی نەهێشتنی بۆنی پیس لەهەوادا دەدات.

**١٧- قلـوی** alkaline

**ئەلـکالی ، تفت**

وەسفی ماددەیەکە کەڕەو شتێکی تفتانەی هەیە، و بری سۆد یۆم، یان پۆتاسیۆم لەپێو یست زیاتر دەبێت تێیدا، بۆ پێکهێنانی فلسبار لەگەڵ ئەو سلیکایەی کە تێیدایەتی.

**۱۸- مادة قلوية** alkali

ئاسایی بەکاربۆناتی سۆدیۆم، یان پۆتاسیۆم دەڵێن بەشێوەیەکی گشتی بە هەموو خوێیەکی تاڵ دەوترێت، لەسەرڕووی زەوی، یان لێوە نزیکی.

**۱۹- ألكلة** alkylation

**ئەلکیلێن**

گۆڕینەوەی گەردیلەی هایدرۆجینە لە ئاوێتەیەکی عەتری (ئاڕۆماتی)دا، بەڕەگێکی ئەندامیی ئەلیفاتی، بۆ نموونە، یەکگرتنی گەردی هایدرۆکاربۆنێکی ئۆلیفینییە لەگەڵ گەردە هایدرۆکاربۆنییە عەترییە کە (ئاڕۆماتی) لە نەوتسازیدا (پیشەسازی نەوت).

**۲۰- زيت تشحيم تروس متعدد الأغراض** all purpose gear lube

ڕۆنی چەورکردنی ڕەوشت تایبەتن، بۆ چەورکردنی قەڵغانە (گێڕە) فرە مەبەستەکان بەکاردەهێنرێن.

**۲۱- شحم ألوميني الأساس** aluminium base grease

**پیوی بنچینە ئەلومینیۆمی**

پیوێکە، بەتێکەڵکردنی هاڕاوەی ئەلەمنیۆم، یان یەکێك لە ئاوێتە چەورەکانی لەگەڵ پیودا.

**۲۲- كلوريد هايدروجين لامائي** anhydrous hydrogen chloride

**کلۆریدی هایدرۆجینی نائاوی**

گازی هایدرۆجینە، پاش تێدا نەهێشتنی شێ بەهۆی وشککرد نەوەیەوە بەماددەیەکی ئاومژی وەك ترشی گۆگردێکی خەست یان پێنجۆکسیدی فۆسفۆر، یان کلۆریدی کالسیۆمی نائاوی.

**۲۳- أنود- مصعد** anode

**ئانۆد - بەرزەك**

هەرتەن یان ڕوویەکە، بەستراپێت بەجەمسەری موجەبی تەزوویەکی کارەباییەوە.

٢٤- مضــافات منع الرمد    anti - knock additive

تێکرد نی دژەلێدان ( دژە تەقە )

هەندێ لەو مادده کیمیاییانەی دەکرێنە هەندێ جۆری ئەوسووتە مەنییانەی لە ئامێرە ناوە سووتەکاندا بەکاردە هێنرێن، بۆ نەهێشتنی ئەو تەقەیەی لـە ناڕێك و زوو سووتانـی سووتەمەنی پەیدادەبێت.

٢٥- مســتحلب مائــی    aqueous emulsion

ئاوە شـیراوك

وردە دڵــۆپی شــلێکی لەئاودانــە تواوەیــە، وەك د ڵــۆپی ڕۆن لــە ئــاودا گیرساوەوایە.

٢٦- أروماتیات ( عطریـات )    aromatics

ئەرۆماتییەکان ( عەترەمەنی )

١- ئاوێتــەی ئەنــدامین، نــاوکی نــەوتیان تێدایــە لــە گەردەکانیــدا یــان هــەر ماددەیەکی تری وا، کەڕەوشتی عەتریان هەیە.

٢- ئەو ماددانەن کە بۆنیان خۆشە، یان چێژێکی خۆشیان هەیە، هەندێ جار لەڕۆنە رووە کییەکان دەردە هێندرێن.

٢٧- مســتخلصات أروماتیة = مســتخلصات عطریة    aromatlc extracts

پوختەی ئاڕۆماتی = پوختە عەترییەکان

ماددەی ئارۆماتین، یان بەڕێگەی کیمیایی، یان بە دڵۆپاندن لە بنەڕەتەکانیان دەردەهێنرێن.

٢٨- الجزء الآروماتی ( الجزء العطری )    aromatic fraction

بەشی ئارۆماتی ( بەشی عەتری )

ئەودڵۆپاوەیە کە ئاوێتە عەترییەکانی تێدایە.

٢٩- مذ یب نفثا الآروماتي ( العطري )    aromatic solvent naphtha

توێنەرەوەی نەفـثای ئاڕۆماتی ( عەتری )

تێکەڵـە هایـدرۆکاربۆنێکی پـاڕافینی و نەفـثــینەکانـە، کـە هەنـدێ دڵۆپـاوی ئاڕۆماتی تێدایە کە لە دڵۆپاندنی خاوی نەوت پەیدا دەبێت.

aromatisation ٣٠- أرمتة – تعطير

ئارۆمەتاندن - عەتراندن

کردەی گۆڕینی ئاوێتەیەکی ئەندامیی ئەڵقەیی ئەلیفا تییە، بۆ ئاوێتەیەکی ئەندامیی ئارۆماتی،بەڵێ لابردنی چەند گەردیلەیەك هایدرۆجین، بەگەرمی و پەستان، یان بەبوونی هاندەرێك.

asphalt primer ٣١- ناو پۆشی ئەسفەلتی

ڕووپۆشینێکی سەرەتاییە لەئەسفەلت، بۆ ناوپۆشینی ئەو ماددانەی کە دەمانەوێت دای بپڕین، وەك ئامادەکارییەك بۆ داپۆشینی بەچەند چینێکی تری بۆیە.

asphaltene ٣٢- ئەسفەلتین

ئەسفەلتین

ئاوێتەی کێشی گەردیی گەورە و پلەی کوڵان بەرزە و ڕەوشتەکانی لەئەسفەلت دەچێت.

atomization ٣٣- (أ) ترذيذ

گەرد پلا ندن ، پر ژاند ن

گۆڕینی شلێکە بۆ پرژەی زۆر ورد بە پەستانی هەوا

(ب) تذ رير

ورداندن ، پرژاندن

وردکردنی تەنێکی ڕەقە بۆ پارچەی زۆر ورد لە ژێر هەندێ بارودۆخی تایبەتیدا.

autoclave ٣٤- أوتو كلا ف

ئۆتۆ کلا ف ، ئۆ تۆ کلێڤ

ئامێرێکی تایبەتە، کارلێکە کیمیاییەکانی تێدا ڕوودەدات، لەژێر پەستانێکی بەرزوو پلەیەکی گەرمیی بەرزدا، یان بەهەڵم گەرم دەکرێت، یان بەکارەبا، هەروەك هەندێ جار لەخاوێنکردنی کەلوپەلی نەشتەرگەری (برینسازی) یان کەلوپەلی تاقیگە و جل وبەرگ وشتی تردا بەکارد ێت.

٣٥- **غازۆلين طا ئرات** aviation gasoline

**گازۆلین ( بەنزین ) فڕۆکە**

**یەکێکە لە دلۆپپێنراوەکانی نەوت، لەجۆرەها هایدرۆکاربۆنی پارافینی پێك د ێت، وئۆکتانە ژمارەکەی بەرزە.**

٣٦- **أكتان طائرات** ( ١٠٠ – ١٣٠ ) aviation octane(١٠٠-١٣٠)

**ئۆکتانی فڕۆکە ( ١٠٠ – ١٣٠ )**

**بەنزینی فڕۆکەیە، ئۆکتانە ژمارەکەی( ١٠٠ – ١٣٠ )ە.**

# (B)

**٣٧- عارضة** baffle

**بەربەست**

تویژاڵێکی ڕەقی کانزایان دارە، دەبێتە کۆسپ لەڕێی گازیان شلێکداو دەبێتە هۆی لادانی لە ڕێڕەوە بنەڕەتیەکەی، وەك ئەو بەربەستانەی لەناو ئەو دەفری کارلێکی کمیاییدا دادەنرێت کە قولاپێکی تێدایە، یاریدەی ئەو بەربەستە دەدات کە نەهێڵێت شلەکە لەگەڵ قولاپەکەدا بخولێتەوە و بەوەیش یارمەتی دەدات کەبە تەواوی ماددەکان تێکەڵ بن

**٣٨- رحلة التوازن** ballast voyage

**گەشتی هاوسەنگی**

گەشتی نەوت هەڵگرەکانە بەبەتاڵی، بۆ بەندەری بارکردن و گەنجینەکان پڕ دەکات لە ئاو تەنیا بۆ پاراستنی هاوسەنگییەکەی.

**٣٩- برميل** barrel

**بەرمیل**

١-پێوەرێکە کە پێوەرەکانی کێش، یان قەبارە، بڕکەی بەجیاوازیی ئەومە بەستەی تێیدا بەکاردێت دەگۆڕدرێت، لەنەوتدا، بەرمیل، بەهاوتای (٤٢) گالۆن دادەنرێت (١٥٨لیتر).

٢- دەفرێکی لوولەکییە، لە تویژاڵی داریان کانزا، دروست دەکرێت و بۆ هەڵگرتنی ماددە ڕەق و شلەکان لەپیشە سازید ا بەکاردێت.

**٤٠- المخزون الرئيسى** base stocks

**کۆکراوەی سەرەکی**

کۆکراوەی بنچینەیی خاوەکان.

**٤١- تشغيلة** batch

**خستنە گەر**

باسی کردەیەکی پیشەسازیی تەواوە،کەبەچەند جارێك تەواو دەبێت ، بەماددە خاوەکان دەست پێ دەکات و بەدروستکراوی کۆتایی دێت.

**٤٢- برج التشغيلات** batch column

**كەلوی خستنە گەڕەكان**

كەلویەكە،كردە پیشەسازییەكانی بەچەند جارێك تێدا ڕوودەدات.

**٤٣- مصنع التشغيلات** batch plant

**كارگەی خستنەگەڕەكان**

كارگە، یان بەشە ئامێرێكە، كەكردە پیشەسازییەكانی بەچەندجارێك تێدا ڕوودەدات و بەرهەمهێنان تێیدا بەردەوام نابێت، بەڵكو بەشێوەی خستنەگەڕی پچڕپچڕ دەبێت.

**٤٤- شحم كراسي المحاور** bearing grease

**پیوی ئاراستەكاری**

جۆرە پیوێكە، بەرگەی گەرمیی زۆر دەگرێت و بۆ چەوركردنی تەوەری ئامێرە خێرا جوولاوەكانە.

**٤٥- بنزول** benzol

**بەنزۆل**

ئاوێتەیەكی ئارۆماتییە، لەكاربۆن و هایدرۆجین پێك دێت، شێوگی كیمیاییكەی ($C_6H_6$)ە، وشلێكی بێڕەنگە، لە (٨٠ س) دا دەكولێت، ولە (٥,٥)س دا شل دەبێتەوە ولەدلۆپاندنی قەترانی خەلوز پەیدا دەبێت و وەك توێنەرو بۆدروست كردنی زۆر ئاوێتەی ئەندامی گرنگ بەكارد ێت.

**٤٦- قابلية الهدم الاحيائی** biodegradibility

**زیندە شییە وە بۆكی**

ئەوكێشانەن كەبەهۆی بەكتریاوە پەیدا دەبن، لەئەنجامی زیندە كاریگەرێتی لەسەر ئاوێتە ئەندامییەكان و ماددەی كاریگەری زیانبەخش لەسەر ئاوەڕۆكان پەیدا دەبێت.

**٤٧- بیتومین - قار** bitumen

**بیتومین - قیر - قەتران**

تێكەڵە هایرۆكاربۆنێكی بەستوویان نیمچە بەستوی پڕە كاربۆن و هایدرۆجینە.

**٤٨- قَصْر** bleaching

**ڕەنگبردن، چواندنەوە**

کردەی ڕەنگ لابرد نە لەماددەیەك، یان بەڕێگە کیمیاییەکان، یان بەڕێگەی سروشتی، وەك لابردنی ڕەنگی هەندێ جۆرە قوماشێك بەهۆی گازی کلۆرەوە، یان سپیکردنەوەی کرۆکی کاغەز بەهۆی هایپۆ کلۆریتی سۆدیۆمەوە.

**٤٩- مزج** blending

**تێکەڵکردن**

پێکەوە تێکەڵکردنی دووشل، یان ماددەیەکی ڕەق بەماددەیەکی شلە و پێکهێنانی تێکەڵێکی چونیەکە.

**٥٠- مصنع المزج والمعالجة** blending and treating plant

**کارگەی تێکەڵکردن و چارەسەر**

ئەو بەشە ئامێرانەن، کە کردەی تێکەڵکردنی شلەکان وچارەسەریانی تێدا ڕوودەدات بۆ چاکسازیی ڕەوشتەکانیان.

**٥١- مراجل** boilers

**کوڵێنەکان**

ئەو ئامێرانەن، کە ئاویان تێداگەرم دەکرێت و دەگۆڕدرێت بۆ هەڵم.

**٥٢- مضخة تقوية** booster pump

**ترومپای بەهێزکردن**

ترومپایەکە، لەزۆرکردنی پەستانی شلەکان لە ناو بۆرییەکاندا بەکار دەهێنرێت.

**٥٣- محطة تقوية** booster station

**بنکەی بەهێزکردن**

ئەوبنکەی پاڵپێوەنانە سەربارانەن کەلەسەر هێڵی بۆرییە نەوتەکان دادەنرێن، بۆئەوەی پاڵ بەنەوتەوە بنێن لەناو ئەو بۆرییانەدا.

**٥٤- هیدرو کربونات متفرعة السلسلة** branched chain hydrocarbons

**هایدرۆکاربۆنە زنجیرە لقهاویشووەکان**

ئەوئاوێتە ئەندامییانەن، کەلەکاربۆن وهایدرۆجین پێکهاتوون و گەردیلەکانی کاربۆن تێیاندا بەشێوەی زنجیرەی لقهاو یشتوو ڕیز بوون.

bright stocks ٥٥- خامات منقاة – مخلفات منقاة

خاوە درەوشاوەكان - پاشماوە درەوشاوەكان

ڕۆنی چەوركردنی پلەی خاوێنی بەرزن، كە پڕۆپانی شل خاوێن كراونەتەوە چـونكە ڕۆنـی چـەوركردنی تێـدا دەتوێتـەوە ومـاددە نـامۆ وخەوشـە ئەسفەلیتیەكان بەنەتواوەیی دەمێننەوە و لەكاتی دڵۆپاندنی پڕۆپاندا، ڕۆنی چەوركرد نەكان لە بارێكی خاوێندا جیادەبنەوە.

٥٦- الجمعية البريطانية لإختبار الطرق

British Rroa Ttestin Aassociatio (B .R .T .A)

كۆمەڵەی بریتانیایی تاقیكردنەوە ی ڕێگاكان

٥٧- المواصفات القياسية البريطانية

British Standard Sspecificatio (B .S .S)

ڕەوشە پێوانەییە بریتانیاییەكان

ئـەو ڕەوشـە تایبەتانـەن، كـە پلـەی باشـیی ماددەخاوەكـان، یـان بەرهەمـە پیشەسازییەكان دیاری دەكەن.

bubble cap ٥٨- غطاء الفقاقيع

بڵقە سەرپۆش (سەرقاپ)

سەرپۆشێكی كانزاییە،دەخرێتە سەر كونە تایبەتییەكانی ناو كەلووەكانی لێكهەڵوەشان،لەپیشەسازیی نەوت ( نەوتسازی) دا.

bubble ap tray ٥٩- صينية غطاء الفقاقيع

سینیی سەرقاپی بڵقەكان

ڕەوشی بەربەستە ئاسۆییە كونكونەكانی ناو ستوونەكانی لێكهەڵوەشانن.

bulk ٦٠- جملة

گرۆ، تۆپەڵ

bulk plant ٦١- المصنع الشامل

كارگەی گشتگر

گەنجینەی بەرهەمەكانی نەوت.

٦٢- مصباح حريق burner

چرای سووتـان

ئامێرێکـە، سـووتەمەنیی تـێ دەکرێـت کـە تێکەڵـە لەگـەڵ هـەواو ئۆکسـجین و گەرمییەکی زۆری لێ پەیدا دەبێت.

٦٣- بیوتـاد ایین butadiene

بیوتـاد ایین

گـازێکی ئەندامییـە، لـەکاربۆن وهایـدرۆجین پێـك د ێـت و گەردەکـەی چـوار گەردیلە کاربۆن دووبەندی ناتێری تێدایە، شێوگی کیمیاییەکەی ( $C_4 H_6$) و ئاوێتەیـەکی چـالاکە، بەشـداری دەکـات لـە دروسـتکردنی هەنـدێ گونجـۆك (پلاستیك) و هەندێ جۆری لاستیکی دەستکرددا.

٦٤- بیوتـان butane

بیوتـان

گـازێکی ئەندامییـە، لـە کـاربۆن و هایـدرۆجین پێك دێت شـێوگی کیمیاییەکـەی ( $C_4H_{10}$ )ە وەك سووتەمەنی بەکاردێت و لە لوولەکدا دادەگیرێتەوە.

٦٥- خطوط التحويـل by - pass Lines

هێڵەکانی گواستنەوە

ئەو هێڵەبۆرییە لاوەکییانەن بۆ گواستنەوەی نەوت لەناوچەیەکەوە بۆ یـەکێکی تر.

٦٦- منتج جانبی by - product

بەرهەمی لاوەکی

یەکێکە لەوماددانەی لەکردە پیشە سازییەکان پەید ا دەبێت.

# ( C )

٦٧- **تدريج - معايرة** calibration

**پلەکاری**

**دانـانی نیشـانە، لەسـەر ئامێرەکـانی پێـوان وکێشـان، کـە ڕێـژەی هەڵـە لـە ئامێرێکدا دیاری دەکات.**

٦٨- **القيمة السعرية** caloyific ueval

**گەرمۆکە بەها**

**ژمارەی ئـەو گەرمۆکـە گەورانەیـە، کـە لـە سـووتانی گازەکـان یـان سـووتەمەنی پەیدا دەبێت.**

٦٩- **جيهاز كلفن ذوالكأس المفتوحة** calven open cup (coc)

**ئامێری کۆپی کراوەی کەلڤن**

**ئامێرێکە، بۆ پێوانی پنتی درەوشانەوە بەڕێگەی کوپی کراوە.**

٧٠- **سعة** capacity

**فراوانی**

**١-توانستی گرتنە خۆی وزە، یان هێز.**

**٢- نیشـانەی قەبارە**

٧١- **كربيد** carbide

**کاربید**

**ئاوێتەیـەکی دووتوخمـەی کـاربۆن و یـەکێك لـە کانزاکانـە، وەك کاربیـدی کالسیۆم ($CaC_2$) یان کاربیدی ئەلومنیۆم ($Al_4C_3$)**

٧٢- **ثنائى أوكسيد الكربون** carbon dioxide

**دوانۆکسـیدی کاربۆن**

**گـازێکی بێڕەنگـی نەسـووتە، لـەئاودا دەتوێتـەوە، لـە لولـەکی کانزاییـدا دادەگیرێتـەوە بـەهۆی پەسـتانەوە و لـە دروسـتکردنی گازاوەکـان و ئـاگر کوژاندنەوەدا بەکاردێت.**

٧٣- **ثنائي كبريتيد الكربون** carbon disulphide

**دوانە گۆگردیدی کاربۆن**

شلێکی بێڕەنگی بۆگەنی سووتۆکە، لە (٤٦,٢ س)ە دا دەکوڵێت و لەئاودا ناتوێتەوە، بەڵام لەکهولو ئیثەردا دەتوێتەوە و وەك توێنەرو لەهەندێ پیشە سازیدا بەکاردێت، وەك پیشەسازیی ئاوریشمی دەستکرد، شێوگە کیمیاییەکەی ($CS_2$) ە.

٧٤- **أحادي أوكسيد الكربون** carbon monoxide

**یەکە ئۆکسیدی کاربۆن**

گازێکی ژەهری بێڕەنگە، کەم لە ئاودا دەتوێتەوە، لە ناتەواو سووتانی کاربۆن پەیدا دەبێت، شێوگە کیمیاییەکەی ($CO$) یە.

٧٥- **بقاية الكاربون** carbon residue

**پاشماوەی کاربۆن**

ڕێژەی سەدیی کاربۆنی ماوەیە، پاش گەرمکردنی ڕۆنەکانی چەورکردن لەبۆتەیەکی داخراو و لە بارودۆخێکی تایبەتدا.

٧٦- **حديد الزهر ( حديد الصب )** cast iron

**ئاسنی داڕشتە**

ئاسنی پەیدابووی فڕنە بەرزەکانە، چڕییەکەی دەگاتە (٧,٨٦) وپلەی شلبوونەوەی نزیکەی (١٢٧٥ – ١٥٠٥)س.

٧٧- **منشط وسيط** catalyst regenerator

**چالاککەرەی نێوانی، نێوانە چالاککەرە**

ئامێرێکە، چالاککردنەوەی هاندەرێکی تێدا ڕوودەدات بە گەرمکردن، یان بە هەندێ ماددەی کیمیایی.

٧٨- **وحدة الوسيط** catalyst unit

**بەشی نێوانی ( نێوانە بەش )**

کۆمەڵە ئامێرێکە، هەندێ کردەی کیمیایی تێدا ڕوودەدات بەبوونی هاندەریك وەك لێکردنەوەی ئاوێتەیەکی ناتێر بەهۆی هایدرۆجینەوە بەبوونی کانزای نیکڵی ورد بەش بەش کراو.

catalytic hydrogenation process **٧٩- عملية الهَدْرَجَة الوسيطية**

**كردەی نێوانە هایدرۆجینـاندن**

کــردەی لێکردنــەوەی بەنــدە ناتێرەکانــە لــە ئاوێتەیــەکی نــاتێردا بــەهۆی هایدرۆجینەوە بەبوونی هاندەر.

catalytic reforming unit **٨٠- وحدة التحسين الوسيطية**

**بەشی نێوانە چاکسازی**

کۆمەڵــە ئامێرێکــە، کەچاکســازیی ڕەوشــتی دڵۆپێنراوەکــانی نــەوتیان تێــدا ڕوودەدات، وەك گــازۆلین (بــەنزین)، بەگــەرمکردنی تاپلەیــەکی گــەرمیی مامناوەندی و لەژێر پەستانێکی بەرزو بەبوونی هاندەر، کە ئۆکتانە — ژمارەی گازۆلین بەرز دەبێتەوە لە ئەنجامی پەیدابوونی هەندێ زنجیرەی چڵ وچێواوی وئاوێتەی ئەڵقەیی.

catalytically cracked gas oil **٨١- زيت الغاز المكسر وسطياً**

**گازەڕۆنی نێوانەتێکشـکێنراو**

یەکێکـە لەودڵۆپێنراوانـەی کـە بەهانـدراوە تێکشــکانی بەرهەمـە قورسـەکانی نەوت دەست دەکەوێت، بەتێکشکاندنی زنجیرەکاربۆنییە درێـژەکان بۆهی تـری کورتتر.

cathodic protection **٨٢- الوقاية الكاثود ية**

**کاثـۆدە پاراستن**

پاراسـتنی جەمسـەرە سالیبەکانە، لـەداخوران، یـان لەسەرنیشـتنی خوێیـەکان، لەکاتی بەکارەباشیکردنەوەدا.

causti wash plant **٨٣- وحدة الغسل بالموادالكاوية**

**بەشی بەماددە ی سووتێن شـتن**

کۆمەڵـــە ئامێرێکـــە، هەنـــدێ دڵۆپێنراوەکـــانی نـــەوتی تێـــدا دەشـــۆردرێت بەداخەسۆدا، بۆ لابردنی ئەو ترشە خەوشانەی دەشێ تێیدابن.

centipoise **٨٤-سنتی بواز**

**سەنتی پۆیز**

بەشــی پێـوانی لینجیـی شـلەکانەو بڕەکـەی (٠،١) پـۆیزە، کەیەکـەی پـەیتی پێوانی لینجی یان شلێتییە.

٨٥- رقـم الـــسيتان cetane number

ڕەنوسی سیتان ( سیتانە ڕەنووس ) یان سیتانە ژمارە

ڕەنووسـێکە بـۆ نیشـانەی چـاکی و گونجـۆکیی سـووتەمەنی دیـزڵ بـەکاردێت و هەرچـەندێك ئـەو ڕەنووسـە بـەرزتربێت، سـووتەمەنییەکە باشـتر دەبێت، سـیتانە ژمارە، بەبەراوردی سووتەمەنیی دیزل بەتێکەڵێکی پێوانـەیی سـیتان ($C_{16}H_{34}$) وئەلفامەثـیل ئە فثالین، وسیتانە ژمارە بـە (١٠٠) و ئـەلفا مـەثــیل نەفثـــالینـە ژمارە بە سفر د اد ە نرێت.

٨٦- قيمة التفحم char value

بوونە خەڵووزە بەها ئەوڕێـژەی بوونـە خەڵووزەیـە، کـە تووشـی ڕۆن دەبێت لەکاتی پلەیەکی دیاری کراو بەرزکردنـەوەی پلـەی گەرمییەکـەی، بـۆ ماوەیـەکی دیاریکراو.

٨٧- الخصـائـص characteristics

تـایبە تمەندییەکان

ڕەوشتە جیاکەرەوەکانی ماددەیەك.

٨٨- الاسـتحلاب الكيميائی chemical emulsification

کیمیا ییە شیراوگکاری

گۆڕینـی هەندێ ڕۆنە بۆ ئاوە گیرساوە، بەهۆی ماددەیەکی کیمیاییەوە.

٨٩- صـهريج الكيمياويات chemicals tank

تـەنکیی کیمیاییمە نییەکان

ئەوتەنکییەیە، کە بۆ تێدا هەڵگرتنی ماددە کیمیاییەکان بەکاردێت.

٩٠- تـبريد مفاجیء chilling

کوتوپڕ ( لەناکاو ) ساردکردنەوە

لەناکاو نزمکردنەوەی پلەی گەرمیی تەنێکە بۆ ژێر سفری سەدی.

٩١- أجهزة الكلو رة chlorinators

ئامێرەکانی کلۆراندن

ئــەو ئامێرانەیــە کــە کلۆرانــدنیان تێــدا ڕوودەدات، وەك کلــۆر خســـتنە نــاو پێکهاتنی ئاوێتە ئەندامییەکان.

**٩٢- ماسك** clip

**گـره**

ئامێرێکی بچووکە بۆ گرتنی شتەکان بەکاردێت.

**٩٣- نقطة الغيم** cloud point

**هەورە پنت**

ئـەو پلـە گەرمییەیـە، کـە ماددەی ڕەقـی تێدا دەسـت دەکـات بەجیابوونـەوە لـە گیراوەکەی لەیەکێك لـە ڕۆنەکانـدا، لـە کـاتی سـاردکرنەوەی لـەژێر بـارودۆخێکی پێوانەیی تایبەتدا.

**٩٤- تناسق** co - ordination

**ڕێکخستن، پێکەوەگونجان**

١-پێکەوە دروست کردنی کۆمەڵە بەشێك، بەرێگەیەکی ڕێکوپێك.

٢- یـەکگرتنی کۆمەڵـە گەردیلەیەکـە، بۆپێکهێنـانی ئاوێتـە یـەکی کیمیـایی، بەجۆرێك یـەکێك لەوگەردیلانـە، جووتێك ئەلـەکترۆن دەدات بـە گەردیلەیـەکی تـر بۆ پێکهێنانی بەندێکی نیوە جەمسـەردار.

**٩٥- عمليـة التخـثير** coagulation process

**کردەی مەیاندن**

کردەی نیشاندنی مڵەمەنییەکان.

**٩٦- تكو يك** coking

**کۆکاندن**

کردەی گۆڕینی نەوت، یان خـەڵووزە بـۆ کـۆك، بەلەناوبـەرە دڵۆپانـدنی ماددەکـە بەبێ بەشداری هەوا.

**٩٧- صـف غرف الإحـتراق** combustion chamber line

**ڕیزە ژووری سووتـان**

کۆمەڵە ژوورێکی لەڕیزێکد ا ڕێکخراون، کردەکانی سوتانیان تێدا ڕوودەدات.

**٩٨- صهريج مخروطي الـسقف** cone roof tank

**تەنکیی بنمیچ قوچەکی**

تەنکییەکە، بۆ پاراستنی شلەکان، بنمیچەکەی بەشێوەی قوچەکە.

٩٩- تلوث contamination ( pollution )

پیسبوون

تێکەڵبوونی ماددەبنە ڕەتییەکەیە، بەهەندێ خەوشی تر، کەکاردەکاتە ڕەوشت و ڕەفتارەکانی.

١٠٠- تقلُّـــص contraction

چوونەیەك، کرژبوون

کەمبوونـــەوەی قـــەبارە، یـــان درێژییـــە، وەك کەمبوونـــەوەی قـــەبارەی گـــاز بەسـاردکردنەوە، یـان کەمبوونـەوەی درێـژیی تـووڵێکی کـانزا بەنزمکردنـەوەی پلەی گەرمییەکەی.

١٠١- أجهزةالتحكم

دەزگاکانی دەستبە رداگرتن ( دابینکردن ) control apparatus

دەزگاکانی ڕێکخستن و دابینکردن لەکردە پیشە سازییە کاندا.

١٠٢- غرفة التحكم control room

ژووری دابینکردن

ژوورێکـە، هەنـدێ لـەو ئـامێرە وردانـەی تێـدا دادەنرێـت، کەچـاودێریی کـردە پیشەسـازییە دیاریکراوەکـان دەکـات و یارمـەتیی ڕێکـوپێکیی بەڕێوەچـوونی دەدات.

١٠٣- صمام تحكُم control valve

دوگمەی ( دەمەوانەی ) دابینکردن

دوگمەیەکە ڕەوینی شل، یان گازێك ڕێك دەخات.

١٠٤- عملية التحويل conversion process

کردەی گۆڕین

گۆڕینە، لەشێوەیەکەوە بۆ یەکێکی تر.

١٠٥- بيرو فسـفات النحاس copper pyrophosphate

پایرۆ فۆسفاتی مـس

خوێی مـسی ترشی پایرۆفۆسفۆرێکە.

١٠٦- رقيقة نحاس copper strip

**توێژاڵی مس**

پارچەیەکی بچووکی تەنکی مسە، بۆ هەندێ مەبەستی کیمیایی بەکاردێت.

١٠٧- عامل التصحيح correction factor

**هۆکاری ڕاستکرد نەوە**

ڕەنووس، یان هاوکێشەیەکە، پێویستە بخرێتە سەر بەهای دۆزراوەی کردەیەك بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی ئەزموونی.

١٠٨- مُرَسِّب كوتريل cottrell precipitator

**نیشێنی کۆترێل**

ئامێرێکە، بۆ نیشاندنی تەنۆکە،یان وردیلە گیرساوەکان بەشێوەی دووکەڵ، یان تەم لە سەرتۆڕێکی تەلی باریکی پەستانی کارەبایی بەرزە.

١٠٩- تيار مضاد counter current

**دژە تەوژم**

تەوژمێکی شل، یان گازە، بەئاراستەیەکی پێچەوانەی ماددەکانی تر دەڕەوێت.

١١٠- التكسير (cracking)

**تێکشکاندن**

دابەش کردنی زنجیرە هایدرۆ کاربۆنییە درێژەکانە بۆ بەشی بچووکتر بەکاریگەریی پەستان و گەرمی و هەندێ جاریش هاندەر.

١١١- حمض كريزليك cresylic conditlons

**ترشی کریزیلیك**

بازاڕە ناوێکی تێکەڵی ئۆرثۆ، ومیثان و پاڕاکریزۆڵە.

١١٢- ظروف حرجة critical conditions

**بارودۆخە شلۆقەکان**

ئەو بارودۆخە دیاریکراوانەن، کە ئەگەر ماددە وتەنی لێ دوورکەوتەوە، لەبارێکەوە دەگۆڕدرێت بۆبارێکی تر، وەك گۆڕانی گاز لەژێر پەستانێکی دیاریکراو وگەرمییەکی دیاریکراودا بۆشل، تەنیا بەنزمکردنەوەی پلەی گەرمی، یەك پلەی سەدی.

۱۱۳- **سحق** crushing

**هاڕین، وردکردن**

**وردکردنی تەنێکە بۆ بەشی بچووك بە پەستاوتن.**

۱۱٤- **قوّة السحق** crushing strength

**هێزی وردکردن**

**پێوانە توانستی تەنێکە بۆ بەرهەڵستیی وردکردن.**

۱۱۵- **قدم مكعب** ( ق$^{۳}$ ) cubic foot

**پێ سێجا** ( پ$^{۳}$ )

**پێوەرێکە، لە پێوەرەکانی قەبارە و دەکاتە ۲۸۳۱۷ سم$^{۳}$.**

۱۱٦- **متر مكعب** ( م$^{۳}$ )

**مەتر سێجا** ( م$^{۳}$ )

**پێوەرێکە، لە پێوەرەکانی قەبارەو دەکاتە ملیۆنێك سم$^{۳}$.**

۱۱۷- **كلوريد النحاسيك** cupric chloride

**کلۆریدی مسیك**

**بلووری شینن، بە ئاسانی لەئاو و کهولدا دەتوێنەوەو دەگۆڕدرێت بۆ ڕەنگی زەردی قاوەییباو کە بلووراوەکەی ون بکات، و لە بۆیە سازی و دروستکردنی مەرەکەب و شتی تریشدا بەکاردێت، یاسای کیمیاییەکەی ($CuCl_{۲}.۲H_{۲}O$)ە.**

۱۱۸- **قطفة في التقطير** cut, distillation

**لێکردنەوەیەکە، لە دڵۆپاندندا**

**زاراوێکە، بەو شلە هاوڕەوشتانە دەوترێ کە لەکاتی دڵۆپاندندا پەیدادەبن.**

۱۱۹- **أسفلت مخفف** cut back asphalt

**قیری ڕوونکراوە**

**ئەو قیرەیە کە هێشتا هەموو ماددە فڕۆکەکانی لێ لانەبرابێت.**

**١٢٠ - تحلُّق** cyclisation

**ئەڵقاندن**

**گۆڕینی ئاوێتەیەکە، کە گەردەکانی زنجیرە ڕاست ( کراوە) بن، بۆ ئاوێتەیەکی تری ئەڵقەیی ( زنجیرە داخراو)، کە گەردەکانی لە ئەڵقە پێك هاتوون.**

**١٢١- فاصل اعصاري** cyclon separator

**جیاکەرەوەی گەردەلوولی**

**ئامێرێکە لە کۆڤك دەچێت، ئەو گازانەی کە لە یەکێك لە کردە پیشەسازییەکان پەیدادەبنی تێ دەکەن و ئەو گازانەی تێدا دەخولێنەوە، خولێك، یان زیاتر، مادده گیرساوەکان بەو گازانەوە جیادەبنەوە.**

# (D)

۱۲۲- فصل الاسفلت من النفط — de-asphalt the oil, to

جیاکردنەوەی قیر لە نەوت

کردەی پوختەکردنی ڕۆنەکان لە ئیسفەڵت.

۱۲۳-فصل الزيت عن الشمع — de-oil the wax, to

جیاکردنەوەی ڕۆن لە مێو

۱۲٤- إخمال — deactivation

ناچالاککردنی، ناکاراکردن

گـۆڕینی ماددەیەکـە، لـە بـارە چـالاکەکەیەوە بـۆ بـارێکی تـری ناچـالاك وەك نەهێشتنی چالاکیی هاندەرێك.

۱۲٥- صَفْق — decantation

ڕۆکاری ( پالأوتن )

ڕۆکردنـی شـلە ڕوونەکەیـە لـە دەفرێـك و بـەجێمانی ( هێشـتنەوەی) نیشـتەو شلەکانی ترە لە بنی دەفرەکەدا.

۱۲٦- أنخفاض الضغط — decline, pressure

نزمبوونەوەی پەستاوتن

نزمبوونەوەو دابەزینی پەستانە، لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تری لەو کەمتر.

۱۲۷- تفريغ الوقود — defueling

ئاوەڵەکردنی ( بەتاڵکردنی ) سووتەمەنی

کردەی سووتەمەنی تێدا نەهێشتنی تەنکییەکە.

۱۲۸- نزع الماء = نكز — dehydration

بێئاوکردن = وشککردن

تێدا نەهێشتنی توخمەکانی ئاو لە ئاوێتەیەك، یـان ئاووشـیٚ مـژین لـە شـلێك بـە هـۆی ماددەیـەکی وشـککەرەوە ( ئاومـژ) ەوە، وەك ($H_2SO_4$) ی خەسـت یـان ( $CaCl_2$) یان ($P_2O_5$) ....تاد.

١٢٩- نزع كلوريدا الهيدروجين dehydrochlorination

داماڵینی كلۆریدی هایدرۆجین

پوختەكردنی ڕۆنەكان لە گازی كلۆریدی هایدرۆجینی ترش بە هۆی تفتەكانەوە، یان بە ئاوشتنەوە.

١٣٠- نزع الهیدروجین dehydrogenation

بێهایدرۆجینكردن

لابردنی هایدرۆجین لە ئاوێتەیەك بە ڕێگەیەكی كیمیایی، وەك گۆڕینی ئاوێتەیەكی ئەلیفاتیی تێر، بۆ ئاوێتەیەكی ناتێر، یان ئاوێتەیەكی ئەڵقەیی ( ئاڕۆماتی)، بەلابردنی ژمارەیەكی دیاریكراو گەردیلەی هایدرۆجین.

١٣١- نزع المعدنیات demineralization

بێكانكردن

لابردنی ناوەرۆكە كانزاكان لە شلێك.

١٣٢- ترویق demisting

ڕوونكردنەوە، ڕۆشنكردنەوە

لابردنی خەوش و خڵتە شل، یان ڕەقەكانە لە شلێك، كە دەبووە هۆی ناڕۆشنیی شلەكە.

١٣٣- برج استخلاص البنتان depentaniser column

كەلوی پوختەكردنی پێنتان

كەلوی جیاكردنەوەی پێنتانە لە ناوەرۆكە ڕۆنەكانی تر.

١٣٤- برج تجزئة صغیر dephlegmator

كەلوی بەشكاریی بچووك

كەلویەكە، بۆ خەستكردنەوەی بە شێكی ئەو هەڵمەی كە پێیدا تێ دەپەڕێت بەكاردەهێنرێت.

١٣٥- تخفیض الضغط depressurizing

كەمپەستانكردن، نزمكردنەوەی پەستان

كەمكردنەوەی پەستانە، لە بەهایەكەوە بۆ بەهایەكی لەو كەمتر.

**١٣٦- نزع الأملاح** desalting

**بێخوێکردن**

لابردنی خوێیەکانەلە شلەکان، یان بەئاوەشۆر، یان نیشاندن، یان بە ڕێگاکیمیاییەکانی تر.

**١٣٧- مُجفف** desiccant

**وشککەرەوە**

وەسفی ئەو ماددەیەیە، کە دەتوانێ شێ، یان ئاوبمژێت.

**١٣٨- نزع الكبريت** desulphurization

**بێگۆگردکردن**

کردەی لێ دەرهێنانی(داماڵینی) مادده گۆگردییەکانە لە خەستەی کانزایی، یان لە مادده نەوتییەکان.

**١٣٩- جهاز نزع الكبريت** desulphuriser

**ئامێری گۆگرد داماڵین، بێگۆکردکەرە**

ئامێرێکە، کە ئەو خەوشە گۆگردییانەی لە ڕۆنەکاندا هەن لادەبات، بە ژەنینیان لەگەڵ ئەلکالییەکان، یان بە ڕێگەی تر.

**١٤٠-حجاب** diaphragm

**پەردە، ڕووپۆش**

جیاکەرەوەی نێوان دووشتە، کە بتوانرێت پلەی ڕووپۆشینەکە دابین بکرێت.

**١٤١- ثنائي كلورو أثيلين** ( $C_2H_2Cl_2$ ) dichoroethylene

**دوانە کلۆرۆئەثیلین**

شلێکی بێڕەنگە، وەك توێنەرەوەیەك بۆ لاستیك و پوختەکردنی بۆیەو بۆ نەمەنییەعەترییەکان و لە سارکردنەوەدا بەکاردێت.

**١٤٢- وقود الديزل** diesel fuel

**سووتەمەنیی دیزڵ**

سووتەمەنییەکی قورسە، لە مەکینەکانی دیزڵدا بەکاردێت.

**١٤٣- تخلّص** disposal

**پوختەکردن**

ڕزگاربوون لە خەوش و پاشەڕۆکان.

**١٤٤- بئر المخلفات = بئر العـادم** disposal well

**بــیری بــەرماوە ( پاشــەڕۆ ) کــان = بــیری خەوشــەکان، کــە پاشــەڕۆکانی تیــا کۆدەکرێتەوە.**

**١٤٥- الجزء المقطـر** distillate fraction

**بەشی پالآوتە**

یەکێك لە بەشەکانی شلە پالآوتەکە ( دلۆپێنراوەکە) یە.

**١٤٦- خط انابیب ماء القطیر** distillate water pipe line

**هێڵە بۆرییەکانی ئاوی دلۆپێنراو**

ئەو هێڵە بۆرییانەیە، کە ئاوە دلۆپێنراوەکەیان پێدا تێ دەپەڕێت.

**١٤٧- مصنع التقطیر** distillation plant

**کارگەی دلۆپاندن**

ئەو کۆمەڵە ئامێرانەیە، کە کردەکانی دلۆپاندنیان تێدا ڕوودەدات.

**١٤٨- تحوُّل** disversion

**گۆڕان**

گۆڕانی ئاقار، یان ڕەوت و ڕێڕەو.

**١٤٩ – زیت السحب** drowing oil

**ڕۆنی ڕاکێشان**

ڕۆنێکی تایبەتە، لە ئامێرەکانی ڕاکشانی کانزاکاندا بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی لەکاتی ڕاکشانیدا نەپچڕێت.

**١٥٠- مذیب التنظیف الجـاف** dry cleaning solvent

**تویێنەرەوەی وشکە پاککردنەوە**

هەندێ وەرگرتە هالۆجینییەکانی نەوتە، کە پلەی کوڵاندنیان مامناوەندییەو لە کردەکانی وشکەپاککردنەوەدا بەکاردێن، وەك چوارە کلۆریدی کاربۆن.

# (E)

١٥١- **سجل كهربائي** electrical log

**تۆماری کارەبایی**

هێڵێکی شەپۆلییە ( شەپۆلە هێڵێکە)، جیاوازی پلەی بەرگریی کارەبایی چینەکانی بیرێك دەداتەوە و ئەم تۆمارانە بۆ پەیوەستیی بیرەکان لە ڕووی جیۆلۆجییەوە بەکاردەهێنرێت.

١٥٢- **الكبريت العنصر** elemental sulpher

**گۆگردی توخم ( توخمە گۆگرد )**

گۆگردی ئازادی لەگەڵ توخمی تر یەکنەگرتووە.

١٥٣- **نقطة التعادل (النهاية)** end point

**پنتی هاوکێشبوون (کۆتایی)**

ئەو پنتەیە کە هاوکێشیی ترش لەگەڵ ئەلکالییەك (تفتێك) تەواو دەبێت، بە هۆی یەکگرتنی کێشێکی هاوهێزیی هەریەکەیانەوە.

١٥٤- **لزوجة أنجلر** Engler viscosity

**لینجیی ئەنگلەر**

پێوانی لینجییە بە دیاریکردنی خێرایی ڕەوینی شلێك بە کونێکی تەسکدا.

١٥٥- **مُبَخِّر** evaporator

**هەڵمێن**

ئامێرێکە، شلەکانی تێدا دەگۆڕدرێت بۆ هەڵم، یان بە هۆی گەرمییەوە و یان بە سووککردنی پەستان.

١٥٦- **الجزء المستخلص** extract fraction

**بەشە پوختەکراوەکە**

ئەو بەشەیە، کە لە کردەی پوختەکردن پەیدادەبێت.

## (F)

١٥٧- رصيد التموين feed stocks

سەرمایەی خۆراك ( ژەم )

بڕی ئەو خاوانەیە کە بەشداری دەکەن لە کردەیەکدا.

١٥٨- جهاز التغذية feeder

ئامێری خۆراکپێدان

ئەو ئامێرەیە کە لەڕێگەی خاوەکانەوە دەچێتە ناو هێڵی پیشەسازاندنەوە.

١٥٩- مرشحات filters (filter)

پاڵێوکەکان

ئەو ئامێرانەن کە بۆ جیاکردنەوەی گیرساوە، یان تەنۆلکە ڕەقەکان لە گاز، یان شلەکان بەکاردێن.

١٦٠- خرطوشة المرشح filter cartridge

گوللەی پاڵێوك

ئەوەیە کە لە پاڵێوکدا دادەنرێت و کردەی جیاکردنەوەی گیرساوەکانی پێ جێبەجێ دەکرێت.

١٦١- نقطة الغليان النهائية final boiling point

پنتی کۆتایی کولان

ئەو پنتی کوڵانەیە کە، بەرزترین دەبێت بۆ ڕۆن.

١٦٢- ضغط التدفق النهائي final flowing pressure

پەستانی دوادەرپەڕین

پەستانی شلەکان لەناو بۆرییەکاندا پاش جێگیربوونی.

١٦٣- التحصين من الحريق fire proofing

پاراستن لە سووتان

داپۆشینی ڕووی ماددەیەك ( ڕووپۆشینی) یان تێرکردنی بە ماددەیەکی تر، سووتۆکیی کەم دەکاتەوە.

١٦٤- **لوازم** fitting

**کەلو پەل و پێداویستی**

هەندێك بەشی بچووکی ئەوتۆیە، کە یارمەتیی چەسپاندنی بەشەکانی تری لە خۆیان گەورەتر دەدەن.

١٦٥- **مفاعل ثابت الوسط** fixed –bed – reactor

**کارتێداکەرەی نێوان جێگیر**

ئامێرێکە، کارلێککردنێکی تێدا ڕوودەدات بە بوونی هاندەرێك، بەڵام هاندەرەکە لە شوێنی خۆی بە جێگیری دەمێنێتەوە لەکاتێکدا گازوشلەکان و ماددەکانی تری دەوروبەری دەجوڵێن.

١٦٦- **صهريج ثابت السقف** fixed-rood tank

**تەنکییەکی بنمیچ جێگیر**

تەنکییەکە، بە گۆڕانی بڕی ئەو شلەی تێیدا هەڵگیراوە بنمیچەکەی ناجووڵێت.

١٦٧- **دهم اللهب** flame impingement

**گڕڕەشکردن**

گڕ بەرکەوتنی تەنێك ( لەشێك)

١٦٨- **نقطة الوميض** flash point

**پنتی درەوشانەوە**

ئەو پلە گەرمییەی، هەڵمی ڕۆنی تێدا گڕ دەگرێت.

١٦٩- **صهريج عائم السقف** floating roof tank

تەنکیی بنمیچ سەر شلکەوتە بەو تەنکییە دەڵێن کە بنمیچەکەی سەر ئەو شلە دەکەوێت کە تێیدا هەڵگیراوە.

١٧٠- **جهاز تدفُق** flow element

**ئامێری دەرپەڕین**

ئەو ئامێرەیە، کە دەرپەڕاندنی شل و گازەکان ئاسان دەکات.

flow line ١٧١- خط التدفق

هێڵی دەرپەڕین

هێڵی بۆرییەکە، گاز، یان شلی پاڵ پێوە دەنرێت.

flow pressure, initial ١٧٢- ضغط بدء التدفق

پەستانی دەستپێکردنی دەرپەڕین.

پەستانی شلەکەیە، لە پنتی دەستپێکردنی ناو بۆرییەکاندا.

flue gas ١٧٣- غاز العادم

گازی ئەگزۆز

ئەو گازەی کە لە سووتانی سووتەمەنی پەیدا دەبێت.

flue work ١٧٤- مجری العادم

گازەڕۆی ئەگزۆز

ئەو پێکهاتانەیە، کە گازی ئەگزۆزەکەی پێدا دەڕوات.

flush valve ١٧٥- صمام التنظيف

دەمەوانەی پاککردنەوە

دەمەوانەی ئەو ئامێرەی، ڕۆنی پاککردنەوە پاڵ پێوە دەنێت.

flushing oil ١٧٦- زيت التنظيف

ڕۆنی پاککردنەوە

ڕۆنێکە،بە هۆی پەستاوتنەوە پاڵی پێوە دەنرێت بۆ پاککردنەوەی ئامێرەکان لە پاشماوەی ڕۆنە بەکارهێنراو و نیشتە هەمە جۆرەکان.

fly away oils ١٧٧- زيوت سهلة التطاير

ڕۆنە ئاسان فڕیوەکان

ئەو ڕۆنانەن کە پلەی کوڵاندنیان نزمە و گەرمکردن فڕینیان ئاسان دەکات.

fouling ١٧٨- إتساخ

پیسبوون

پیسبوونی شتێك، یان گۆڕانی، وەك گۆڕانی هەوای پاك بۆ هەوای پیس، یان ئۆکسانی (ژەنگهێنانی ) ڕووی کانزا و دەرکەوتنی توێکی ئۆکسیدەکان لەسەر ڕووەکەی.

۱۷۹- جزء fraction

بەش

بەشێکە لە دڵۆپاو، پلەی کۆڵانەکەی دەکەوێتە بوارێکی دیاریکراوەوە.

۱۸۰- عمود تجزئة fractionating

ستوونی بە شکردن ( لێکهەڵوەشان )

ئـامێرێکی تایبەتـە، لـە ژێـرەوەی شـلە گەرمـەکانی دەچـێتە نـاو و لێـک جیادەکرێنـەوە بـۆ چـەند بەشـێك لـەکاتی تێـدا بەرزبوونـەوەی هـەڵم، بـە جۆرێـك هـەڵمی شـلە پلـەی کـولان بـەرزەکانی لـە ژێـرەوە لێ دێتـە دەرەوە، پێشـی دەڵـێن کەلووی لێکهەڵوەشان.

۱۸۱- تجزئـة fractionation

لێکهەڵوەشان، لێك جیاکردنەوە

کردەی، لێك جیاکردنەوەی تێکەڵە شلێك بۆ پێکهێنەکانی بە هۆی کردەی بەشە دڵۆپاندنەوە.

۱۸۲- طريقة ( فراش ) لإسالة الكبريت Frasch sulphur liquefying method

ڕێگەی ( فراش ) بۆ شلکردنەوەی گۆگرد

ڕێگەیەکە، بۆ دەرهێنانی گۆگرد لـە نـاخی زەوی بـەکاردەهێنرێت، کـە هـەڵمێکی فرەگـەرم دەکرێتـە ناوچـەکانی بـوونی گـۆگردەوە، کـە شـل دەبێتـەوە و پـاڵی پێوەدەنرێتە سەر ڕووی زەوی، لە بارێکی نزیکە خاوێندا.

۱۸۳- غاز طليق free gas

گازی ڕەها

گازێکی یەکنەگرتووە لەگەڵ توخمەکانی تردا، یان گازێکی بەتەنیا بەرزەوەبووە بەبێ گەرمکردن.

۱۸٤- زاد جديد fresh feed

خۆراکی نوێ

خاو، یان مادده نێوانییە کراوە سەرەکانی هێڵی دروستکردنە.

**١٨٥- غاز الوقود** fuel gas

**گازی سووتەمەنی**

ئەو گازانەن، کە وەك سووتەمەنی بەکاردێن.

**١٨٦- مقياس زيت الوقود** fuel oil gauge

**ڕۆنی سووتەمەنیپێو**

ئامێرێکی بچووکە، بڕو پەستانی ڕۆنی سووتەمەنیی کردەیەکی پیٚ دەپێورێت.

**١٨٧- فرفورال** furfural

**فورفوراڵ**

ئاوێتەیەکی ئەندامییە، شێوگی کیمیاییەکەی ($C_5H_4O_2$) و، و ئەڵدیهایدێکی ئەڵقەییە،لە کردەکانی ئاوەشیبوونەوەی مادده کاربۆهێدراتییەکان پەیدا دەبێت و هەندیٚ جار لە دروستکردنی هەندیٚ جۆری گونجۆك ( پلاستیك) دا بەکاردێت.

**١٨٨- استخلاص الغاز بالفورفورال** furfural extraction plant

**بە فورفوراڵ پوختەکردنی گاز**

ڕێگەی جیاکردنەوەی گازەکانە بە فورفوراڵ، یان بە هەڵمە دلۆپاندن، یان بە پوختەکردن بە یەکێك لە توێنەرەوە ئەندامییەکان.

**١٨٩- زيت وقود الأفران** furnace fuel oil

**ڕۆنی سووتەمەنیی فڕن**

ئەو ڕۆنی سووتەمەنییەیە، کە لە گەرمییە فڕنەکاندا بەکاردێت و ڕۆنێکی ڕەوشت تایبەتە.

# (G)

gas blanket ( G –B) **١٩٠- غطاء غازى**

**گازە بەرگ**

**هەورە گازێکە، بۆ جیاکردنەوەی شلەکان لە ئۆکسجینی هەوا بەکادرێت، بۆ ئەوەی نەسووتێن.**

gas freeing operation **١٩١- عملية التخلص من الغازات**

**کردەی ڕزگابوونە، لە گازە تواوەکانی ناوشلەکان، یان بە گەرمکردن، یان بە هەڵگێڕانەوە، یان بە تێپەڕاندنی هەوای پەستێوراو بەو شلانەدا.**

gas –oil separation plant ( G.O.S.P) **١٩٢- جهاز فصل الغاز عن الزيت**

**ئامێری جیاکردنەوەی گاز لە ڕۆن ( ئامێری گاز لە ڕۆن جیاکردنەوە) ئەو بەش، یان ئامێرانەن کە بۆ جیاکردنەوەی گازەکان لە نەوت بەکاردەهێنرێت پێش دڵۆپاندنی.**

gas processing unit **١٩٣- وحدة تصنيع الغاز**

**بەشی گاز دروستکردن**

**ئەو ئامێرانەن، کە بە ڕێگەی کیمیایی گازەکانی چارەسەردەکرێن بۆ گۆڕینی بۆ بەرهەمی تر.**

gas scrubbing **١٩٤- غسل الغاز**

**گاز شتن**

**خەوش لابردنە لە گاز، وەك تێپەڕاندنی گازەکە بە کەلوی تایبەتدا ئاوی پرژێنراوی تێ دەکرێت، بۆ لابردنی ئەو گاز یان خەوشانەی لە ئاودا دەتوێتەوە.**

gas sweetening plant **١٩٥- مصنع تنقية الغاز**

**کارگەی گاز خاوێنکردن**

**ئەو بەشانەن کە کردەی گاز لە خەوشی بۆگەن پاککردنەوەیان تێدا ڕوودەدات وەك لابردنی ئاوێتەی گۆگرد .**

**١٩٦- وقود غازي** gaseous fuel

**گازە سووتەمەنی**

ئەو گازە سووتۆکانەن کە لە کردەکانی، گەرمکردنی دەستکرددا بەکاردێن.

**١٩٧- التغـويز** gasification

**گازاندن**

بەو کردەیە دەڵێن، کە ماددەیەکی تێدا دەگۆڕدرێت بۆ گاز.

**١٩٨- مكونات الكازولين** gasoline components

**پێکهێنەکانی گازۆلین**

ئەو ئاوێتە زنجیرە کار بۆ نیو شتیتردارانەن کە لە پێکهاتنی گازۆلیندا هەن.

**١٩٩- عملية إصلاح هيدروجين للجازولين** gasoline hydro forming process

**کردەی چاکسازیی هایدرۆجینەکان بۆ گازۆلین**

چارەسەری هەندێ جۆرە گازۆلینە بە گەرمی و پەستان، بە بوونی هاندەرو گازی هایدرۆجین، بۆ بەرهەمهێنانی گازۆلینی ئۆکتانە ژمارە بەرز.

**٢٠٠- علم كيمياء الآرض = جيوكيميا** geochemistry

**کیمیای زەویزانی = زەمینۆ کیمیا**

ئەو بەشەی کیمیایە، کە تایبەتە بە شیکاریی نموونەی بەردو بەردینەکان بۆ زانینی پێکهاتن و بارودۆخی پێکهاتن و دابەشبوونیان لە سروشتدا.

**٢٠١- عصا الغمر للدرجه** graduted dip- rod

**داری پلەکراوی نقومکردن**

تووڵە کانزایەکی پلەکراوە بۆ پێوانی بەرزیی شلەکانی ناو تەنکییە گەورەکان بەکاردەهێنرێت.

**٢٠٢- الطريقة الوزنيـة** gravimetric method

**کێشە ڕێگە، ڕێگەی کێشی**

ڕێگەیەکە، لەبڕە شیکاریی ئاوێتەکاندا بەکاردێت و پشت بە دیاریکردنی کێش، یان کێشە ڕێژەکانی ئەو ئاوێتانە دەبەستێ.

**٢٠٣- (أ) القياس الوزني، كێشە پێوان:** gravimetry

**پێوانە زانییە، بەدیاریکردنی کێشەکان**

**(ب) قياس الجاذبية، ڕاکێشانە پێوان:**

**کردەی قەبڵاندنی ڕاکێشان، یان ڕەو ڕەوەی ڕاکێشانە، بەتایبەتی لە ( زەمینە فیزیازانی و جیۆفیزیای کارپێکەریزانی)دا.**

**٢٠٤- الصرف بالجاذبية** gravity- drainage

**ڕاکێشانە ئاوەڕەوین**

**ڕەوینی شلەکانە لە دەفرێکی بەرزەوە بۆ دەفرێکی نزمتر، بێ بەکارهێنانی ترومپا.**

**٢٠٥- زيت تشحيم** grease oil

**ڕۆنی چەورکردن**

**ڕۆنێکی پلە لینجی بەرزەو دەتوانێت بەرگەی گەرمی بگرێت، بۆ چەورکردنی ئامێرەکان بەکاردەهێنرێت.**

**٢٠٦- حمّالة شحم** grease rack

**چەوریدان**

**تۆڕێکی تایبەتە، بۆ پاڵپێوەنان و دوورخستنەوەی پیو لە هێڵی کار بەکاردەهێنرێت.**

**٢٠٧- مصائد شحم** grease traps

**پیوگرە**

**ئەو ئامێرانەن، کە بۆ کۆکردنەوەی پیو و بڵاونەبوونەوە و دەرنەچوونی لە هێڵی کاری سەرەکی بەکاردێت.**

**٢٠٨- أحماض خام** green acids

**ترشەخاوەکان**

**ئەو ترشە خاوانەن کە هێشتا پاک نەکراونەتەوە.**

# (H)

٢٠٩- **طريقة هودري للتكسير الحفري الثابت** — Haudry fixed bed catalitic cracking process

**ڕێگەی هۆدری بۆ هاندراوە شکاندنی جێگیر**

ڕێگەیەکە، زنجیرە گەردیلەکانی کاربۆنی تێدا تێك دەشکێنرێت بە بەکارهێنانی پەستان و گەرمی و تێپەڕاندنی شلە هایدرۆبۆنییەکە، بەسەر چینێکی جێگیری هاندەری گەرمکراو و دەدرایە پاڵ ( هۆدری) ی زانا.

٢١٠- **طُبات** — headers

**داخەرە، دەمەوانە**

ئەو پارچە تایبەتانەن، کە بۆ داخستنی کۆتایی بۆرییەکان بەکاردێن.

٢١١- **مبادل حراري** — heat exchanger

**گەرمی گۆڕەوە**

ئامێرێکە، بۆ بەرزکردنەوە، یان نزمکردنەوەی پلەی گەرمیی گاز، یان شل بەکاردێت، بە ڕەوینی بە دەوری ڕووی دەرەوەی چەند بۆرییەکی تایبەت کە شل، یان گازی تری گەرم، یان سارد پێدا دەڕوات و بە پێچەوانەی ڕەوت و ئاراستەی بۆرییەکانی تر دەڕەوێن.

٢١٢- **الحرارة الخارجة** — heat in put

**گەرمیی ناوچوو**

بڕی گەرمیی دەستکەوتە، کە لە کردەیەکی پیشەسازی، یان خستنەگەڕی ئامێرێکدا سوودی لێ وەردەگیرێت.

٢١٣- **الحرارة الخارجية** — heat out put

**گەرمیی دەرچوو**

بڕی گەرمیی، پەیدابوو لە کردەیەکی پیشەسازی، یان کە هەندێ ئامێری ناوەسووت دەیدەن.

۲۱٤- زيت التدفئة heating oil

رۆنی گەرمکردنەوە

ڕۆنێکــــی پلـــەی درەوشـــانەوە مامناوەندییـــە بـــۆ گەمکردنـــەوەو کـــردە گەرمکەرەوەکانی تر بەکاردەهێنرێت.

۲۱٥- زيوت الخدمة الشاقّة heavy duty oils

ڕۆنەکانی خزمەتگوزاریی گران ( قورس )

وەسفی ئەو ڕۆنانەیە کە بەرگەی پلەی گەرمیی بەرز و زۆربەکارهێنان دەگرن.

۲۱٦- جزء نفثيني ثقيل heavy naphthenic fraction

بەشێکی نەفثینیی قورس

تێکەڵێکە، لە هایدرۆکاربۆن و ئاوێتە ئەڵقەییە پلەی کوڵان بەرزەکان.

۲۱۷- مكونات عالية الغليان high boiling components

ئاوێتە کولآن بەرزەکان

ئەو شل و ڕۆنە پلەی کولآن بەرزانەن کە لە پێکهاتنی نەوتدا هەن.

۲۱۸- جازولين عالي الوميض high flash gasoline

گازۆلینی درەوشەبەرز

گازۆلینی پلەی کولآن نزمی زوو سووت.

۲۱۹- ضغط بخاري عال high vapour pressure

هەڵمە پەستانی بەرز

ئەو شلە پلەی کولآن نزمانەن، کە هەڵمە پەستانی بەرزیان هەیە، واتە پەستانی گەردەکانی هەڵمەکە، لە پلەی گەرمیی ئاساییدا لە هەڵمە پەستانی شلەکانی تر بەرزتر دەبێت.

۲۲۰ – زيوت رش البساتين horticultural spray oil

ڕۆنی پرژاندنی باخەکان

ئەو ڕۆنانەن، کە لە پرژاندنی کشتوکاڵ و باخچەکاندا بەکاردێن بۆ بەرگریی دەردودو.

**٢٢١- المانع الهيدروليكي للإنفجار** hydraulic blow out prevent

**هایدرۆلیكە ڕێگری تەقینەوە.**

ئامێرێكە، بە ئاو، یان شلەكانی تر كاردەكات، ناهێڵێت دەفرەكانی دروستكردن بتەقنەوە، بە ڕێكخستنی پەستان.

**٢٢٢- وحدة تكسير هايدروجينيه** hydro cracking unit ( HY.C) or ( H.oil)

**بەشی هایدرۆجینە شكاندن.**

ئامێرەكانی شكاندنی گەردە گەورەكانی هەندێ ڕۆن بۆ گەردی تری بچووكتر، بە پەستان و گەرمی بە بوونی هایدرۆجین كە ناهێڵێت ئاوێتە ناتێرەكان پێك بێت.

**٢٢٣- وحدة اصلاح هيدروجينية** hydroformer unit

**بەشی چاكسازیی هایدرۆجینی**

ئەو ئامێرانەن كە ڕەوشی ڕۆنەكانی تێدا چاكسازی دەكرێت بە بوونی هایدرۆجین و هەندێ هۆكاری یاریدەدەری وەك پەستان و گەرمی.

**٢٢٤- هدرجة** hydrogenation

**هایدرۆجینێن**

كردەی بە هایدرۆجین لێكردنەوەیە، بۆ نەهێشتنی بەندە ناتێرەكان.

**٢٢٥- هدرجة الفحم** hydrogenation of coal

**هایدرۆجیناندنی خەڵوز**

كارلێكی هایدرۆجین و خەڵوزە لە پلەیەكی گەرمیی بەرزدا و لە ژێر پەستانێكی بەرزدا، بۆ پێكهێنانی ماددەی تری بەهاداری پیشەسازی، وەك بەنزینی ئوتۆمۆبیل و فڕۆكە.

**٢٢٦- غاز كبريتيد الهيدروجين** hydrogen sulfide gas

**گازی گۆگردیدی هایدرۆجین**

گازێكی ژەهرە لە ئاودا دەتوێتەوە و بێڕەنگە و بۆنێكی تیژی هەیە لە بۆنی هێلكەی پیس دەچێت، شێوگە كیمیاییەكەی ($H_2S$) ە.

٢٢٧- برافين مُهدرج hydrogenated paraffin

پارافینی هایدرۆجینێنراو

ڕۆن، یان مێوی پارافینی هایدرۆجینێنراون واته تەواولێکراوەن.

٢٢٨- هيدرومتر hydrometer

هایدرۆمەتر

پێوەری قورسیی جۆریی شلەکانە، یان پێوەری هاوسەنگیی شلەکان.

٢٢٩- نفط مهدرج hydro- petrol

نەوتی هایدرۆجینێنراو

نەوتی بە هایدرۆجین لێکراوە.

٢٣٠- ضغط هيدروستاتي hydrogenated

پەستانی هایدرۆستاتی

پەیداکردنی پەستان بە بەکارهێنانی شل، وەك ئاوو ڕۆنەکان.

٢٣١- وحدة المعالجة الهيدروجينية hydrogenation unit

بەشی چارەسازیی هایدرۆجینی

ئەو بەشەیە، کە ڕۆنەکان بە گازی هایدرۆجین چارەسازی دەکرێن.

# (I)

۲۳۲- ملف إشتعال — ignition coil

کلاڵفەی داگیرسان

لوولخواردوویەکی کانزاییە، پلەی گەرمییەکەی بەرزدەکرێتەوە بەمەبەستی داگیرساندن.

۲۳۳- دَفّاع — impeller

پاڵنەر

ئامێرێکە بۆ پاڵپێوەنان و جووڵاندنی تەنەکان.

۲۳٤- جالون إمـپـريالی — imperial- gallon

گاڵۆنی ئیمپریالی

ئەندازەیەکی پێوانی شلەکانەو دەکاتە چوار لیتر.

۲۳٥- المزج داخل الأنابيب — in-line blending

تێکەڵکردن لەناوبۆریدا

تێکەڵکردنی شلەکانە لە کاتی ڕەوینیان بە بۆرییەکاندا.

۲۳٦- اَلْمَرْمِدْ — incinerator

خوڵەمێشدان

مقەڵییەکی تایبەتە، لە سووتاندنی ماددەکان و گۆڕینیان بۆ خوڵەمێشدا بەکاردەهێنرێت.

۲۳۷- دليل – مؤشر — indicator

ڕێبەر – نیشاندەر

١- ماددەیەکی ئەندامییە، لە گیراوەکانیدا وەك ترشێکی لاواز، یان تفت ڕەفتار دەکات و ڕەنگەکەی لە هەموو گیراوەترش و تفتەکاندا دەگۆڕێت و وەك ڕێبەرو بەڵگە بۆ گۆڕینی خەستیی ئایۆنی هایدرۆجین لە سەنگاندندا بەکاردێت.

٢- ئامێرێکە، وەك کاتژمێروایە، بۆ پێوانی پلەی گەرمی، یان پەستان، یان خێرایی بەکاردێت.

٢٣٨ – لا إنقسامية — indivisibility

**دابەشنەبوونی**

نەتوانایی ماددە بۆ دابەشبوون

٢٣٩- غاز خامل — inert gas

**گازی سست**

گازێکە، دەتوانرێت لە کردەیەکی پیشەسازیدا بەکاربهێنرێت. بێئەوەی بەشداریی کارلێکەکە بکات، وەك گازی نایترۆجین.

٢٤٠- مثبّط — inhibitor

**وەستێن، کپکەرە**

ماددەیەکە، یاریدەی وەستاندنی کارلێکێکی کیمیایی دەدات.

٢٤١- نقطة بدء الفقاقيع — initial buble point

**پنتی دەستپێکردنی بڵق**

ئەو پلەیەیە، کە بڵقەکان دەست دەکەن بە پەیدابوون، لەکاتی بەرزکردنەوەی پلەی گەرمیی شلدا.

٢٤٢- مضخة حقن — injection pump

**ترومپای لێدان ( سرنج )**

ترومپایەکە، بۆ پاڵپێوەنانی شل لە بۆرییەکاندا.

٢٤٣- مبيدات حشرية — insecticide material

**مێروکوژەکان**

ماددەی کیمیایین، بۆ لەناوبردنی مێرو بەکاردێن، یان بە بەرکەوتن، یان بە پەکخستنی کردە زیندەییەکانی لەشی مێرووەکە.

٢٤٤- تعليمات — instructions

**ڕێنمایی**

پەخشنامەیەکە، هەنگاوەکانی ئیشپێکردنی ئامێرەکان، یان باسی کارنامەی تایبەتی بە کردەیەکی پیشەسازی تێدایە.

٢٤٥- **سطح بينى** interface

**نێوانە ڕوو**

ڕووی لێکجیابوونەوەی نێوان دوو بابەتی وەك ڕووی جیاکردنەوەی نێوان ڕۆن و ئاو.

٢٤٦- **رموز المواصفات الدولية** international code specifications

**هێماکانی ڕەوشە نێودەوڵەتییەکان**

ئەو هێمایانەن کە دەوڵەتان لەسەریان ڕێکەوتوون و بۆ نیشانەو ڕێنمایی ڕەوش و تایبەتمەندیی دیاریکراو.

٢٤٧- **أيسوبوتان** iso – butane

**ئایزۆبیوتان**

گازێکی ئەندامیی هایدرۆکاربۆنیی زنجیرە پەلوپۆ هاویشتووە، شێوگە کیمیاییەکەی ($C_٤H_{١٠}$)ە.

٢٤٨- **مركبات متشاكلة** iso-forms

**ئاوێتە هاوشێوەکان**

زاراوێکە بەو گەردانە دەوترێ کە لە گەردە پێکهاتنیاندا ( شێوگی گەردی) چونیەکن، بەلاّم لە ڕەوشتەکیمیایی و شێوگی پێکهاتنیاندا جیاوازن.

٢٤٩- **أيسوبنتان** iso –pentane

**ئایزۆپێنتان**

گازێکی هایدرۆکاربۆنیی لق و پۆپدارە لە پلەی گەرمیی ئاساییدا، شێوگە کیمیاییەکەی ($C_٥H_{١٢}$) ە.

## (J)

٢٥٠- وقود النفاثـات jet petrol (JP) fuel

سووتەمەنیی جێت

شلێکی هایدرۆکاربۆنیی پلەی درەوشانەوە بەرزە.

٢٥١- خطوط أنابيب متراكبة jump over lines

هێڵە بۆریی پێکداچوون

بۆریی یەکتربڕ، بەڵام ناپەیوەستن.

## (L)

٢٥٢- شكل الحرف (L) L-shape

شێوەی تیپی (L)

وەسفی ئەو گۆشە وەستاوانەیە، کە بە زۆری لەسەر شێوەی تیپی (L) ە.

٢٥٣- أرسونات الرصـاص lead arsonate

ئارسۆناتەکانی قوڕقوشم

قوڕقوشمـــە خـــوێی ترشـــی ئارســـۆنیکە، شـــێوەگی کیمیاییەکـــەی ($PbHAsO_4$)ە.

٢٥٤- جازولين رصاصي leaded gasoline

قوڕقوشمە گازۆلین

ئەو گازۆلینەیە، کە ئاوێتـەکانی قوڕقوشم تێکراوە، بۆ بەرزکردنـەوەی ئۆکتانـە ژمارەکەی.

٢٥٥- الجزء الحجمي للسـائل liquefied volume fraction (L.V.F)

قەبارە بەشی شل

یەکەیەکە، لە پێوانی قەبارەکانی دڵۆپاوەکەدا بەکاردێت.

٢٥٦- غاز النفط المسـال — Liquefied Petroleum Gas ( LPG)

نەوتەگازی شلکراوە

ئەو گازانەن کە لە نەوت پەیدا دەبن و بەپەستاوتن شل دەکرێنەوە.

٢٥٧- مرتك الرصاص = أحادي أوكسيدالرصاص — litharge PbO

لیثارج ( مەرتەکی ) قوڕقوشم = یەکۆکسیدی قوڕقوشم

( پێشتر کۆڕ بڕیاری ( مەرتەك) ی بۆداوە)

٢٥٨- نقطة إنسكاب منخفضة — low  pour point

پنتی ڕژانی نزم

کەمترین گەرمییە، کە دەشێت ڕۆنی تێدا دەربپەڕێت لە هەندێ باری پێوانەییدا.

٢٥٩- هدرجة زيوت التزليق — lube hydrogenation

هایدرۆجیناندنی ڕۆنەخزێنەکان

هایدرۆجینانـــدنی ڕۆنـــی چـــەورکردنە لـــە هەنـــدێ بـــارودۆخی تایبەتیـــدا بـــۆ چاکسازیی ڕەوشتەکانی.

٢٦٠- زيت تزليـق — lube oil

خزێنە ڕۆن

جـــۆرە ڕۆنێکـــی کـــانزایی زۆرلینجـــە، بـــۆ پیـــوکردن و چـــەورکردنی تـــەوەری ئامێرەکان بەکاردەهێنرێت.

# (M)

٢٦٣- **مقياس المغنطيسية (مغنطومتر )** magnetometer

**پێوەری موگناتیسێتی ( موگناتۆپێو )**

ئامێرێکە بۆ پێوانی هێزی موگناتیسێتی بەکاردەهێنرێت.

٢٦٤- **صيانة** maintenance

**پارێزگاری، چاکسازی**

چاکسازیی ئامێرەکان و پاراستنیان لە لەناوچوون.

٢٦٥- **سوء التشغيل** mal-operation

**بەدخستنەگەڕ، بەدئیشپێکردن.**

بەکارهێنانی ئامێرەکانە، لە ئیشێکی دوور لەومەبەستانەدا کە بۆی تەرخان کراوە، یان بەبارودۆخێکی نەگونجاودا.

٢٦٦- **فتحة الصيانة** manhole

**کونی پاراستن ( پارێزگاری )**

کونێکی لاوەکییە لە هەندێ لەو ئامێرانەی لە پیشەسازیدا بەکاردێن و بۆلەناوەوە پاراستنی ئەو ئامێرانە بەکاردەهێنرێت، هەروەك هەندێ جار بۆ تێکردنەوەی مادده کارلێککردووەکان بەکاردێت.

٢٦٧- **يدوي** manual

**دەستی**

باسی چۆنێتیی بە دەست بەکارهێنانی و ئیشپێکردنی ئامێرێکە.

٢٦٨- **مواصفات التسويق** marketing sprecification

**ڕەوشەکانی بازاڕاندن ( خستنە بازاڕ )**

ڕەوشت یان ڕەوشی دیاریکراو یان پلەی باشیی گونجاوە کە پێویستە لە کاڵاکەدا هەبێت پێش خستنە بازاڕو دەستاودەستپێکردنی.

**٢٦٩- نقطة الانصهار** melting point

**پنتی شلەوەبوون**

ئەو پلـە گەرمییەیـە، کـە ماددەی ڕەق تێیدا دەگۆڕدرێت بـۆ دۆخـی شلـی ( شل دەبێتەوە) و بۆ ئاشنابوون و ناسینی ئاوێتە جۆراوجۆرەکان بەکاردێت، چونکە هەر ماددەیە پلەیەکی شلبوونەوەی دیاریکراوی هەیە لە باری خاوێنیدا.

**٢٧٠- مرکبتان** mercaptan

**مەرکە پتان**

ئەو ئاوێتە ئەندامییانەن کە کۆمەڵەی ثـایۆڵیـان تێدایـە، لـە گـۆگردو هایـدرۆجین پێك دێـت و نـاوی مەرکـەپتان لـە جیـوەوە وەرگیراوە و ئـەم ئاوێتانـە وەرگرتـەی جیوەن.

**٢٧١- زئبق** mercury

**جیوە**

کانزایەکـە، لـە زیودەچێت، بـەڵام لـە پلـەی کـەرمیی ئاساییدا شلـە، (٨٠) یـەو کێشی گەردیلەییەکەی (٢٠٠,٦١)ەو لەپلەی (٨-,٣٨) ی سەدیدا ڕەق دەبێت ( دەیبەستێ) و لە (٣٧٥,٢) پلەی سەیدا دەکوڵێت.

**٢٧٢- إخفاق معدني** metal failure

**کانزا سەرنەکەوتن، نشوستیی کانزایی.**

باسی کانزاکانە لە کاتی ماندوبوون و هەموارنەکردنی بارودۆخی ئیشپێکردن و بڕینەوەو نوشتانەوەو درزبردن.

**٢٧٣- میثان** methane

**میثان**

هایـدرۆکاربۆنێکی گـازە، شـێوگی پێکهاتنـە کـەی ( $CH_4$) ە، وسـادەترین ئەندامە لەزنجیرەی پارافینەکاندا.

**٢٧٤- میثانول = کحول المثیل (کحول الخشب)** methanol

**میـثانۆڵ = کهولی مەثیل (کحولی دار)**

شـلێکی ئەندامییـە، سـەربەکۆمەڵەی کهولەکانـە، لـە(٦٤,٧) س دا دەکوڵێـت و

بەهەموو ڕێژەیەك لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەبێت وسووتۆکە، کهولی مەثیل ژەهرە، لەبەر ئەوە لە دروست کردنی خواردنەوەی مەستکەر (مەی) و عەترەمەنیدا بەکارناهێنرێت، بەڵام وەك توێنەر لەپیشەسازیدا بەکاردێت .

**٢٧٥- مثيل سيكلوبنتان** methyl cyclopentane(M.C.P)

**مەثیل سایکلۆ پێنیتان**

ئاوێتەیەکی ئەندامیی ئەڵقەییە، کۆمەڵی مەپیل تێیدا پەیوەستە بەئەڵقەی پێنجی پێنتانەوە، شێوگی کیمیاییەکەی ، ($C_6 H_{12}$) ە.

**٢٧٦- شمع د قيق التبلور** microcrystalline wax

**مێوی بلورێن ورد**

مێوێکە، لەکاتی بەهێواشی ساردکردنەوەدا، دەگۆڕدرێت بۆوردە، دەنکۆڵە، کە لە وردە بلوور دەچن.

**٢٧٧- مقطرات وسطية** middle distillates

**دڵۆپاوە نێوانییەکان**

وەسفی دڵۆپاوە نەوتییە پلەی کولاّن مامناوەند ییەکانە، لەچاوبەشەکانی تری دڵۆپاوەکەد ا.

**٢٧٨- مليلتر (مل)** milliliter (Ml)

**میللیلتر (مل)**

ئەندازەیەکی پێوانی قەبارەیە، دەکاتە (١/١٠٠٠) ی لیترێك و لەباری شلەکاندا بەکاردێت.

**٢٧٩- صهريج الخلط** mixing tank

**تەنکی تێکەڵکردن**

دەفرێکە، شلەکانی تێدا تێکەڵ دەکرێن لەگەڵ یەکترد ا.

**٢٨٠- جزئ** molecule

**گەرد**

کۆمەڵەیەکی، دوو گەردیلەیی یان زۆرترە، بەبەندێکی کیمیایی پێکەوە بەستراون لەڕێی ئەلەکترۆنەکانەوە بۆپێکهێنانی ئاوێتەیەکی جێگیری لە

دووگەردیلەی جیاواز یان زۆرتر پێکهاتوو، یان بۆ پێکهێنانی گەردێکی دووانی لە دوو گەردیلەی چونیەك، وەك لە گەردی گازەکاندا.

**٢٨١- ذرات أحادية التكافؤ** monovalent atoms

**گەردیلەی یەکە هاوهێزی**

ئەوگەرد یلانەن، کە لەگەڵ یەك گەردیلە هایدرۆجین یان لەگەڵ گەردیلەیەکی هەرتوخمێکی یەکەهاوهێزی یەك دەگرن.

**٢٨٢- الرقم الأكتاني للمُحرِّك** motor octane number

**ئۆکتانە ژمارەی بزوێن**

ئۆکتانە ژمارەی سووتەمەنی، نیشانەی باشترین جێبەجێکاریی ئەوبزوێنەیە.

**٢٨٣- زيت المحَرك** motor oil

**ڕۆنی بزوێن**

ڕۆنێکی ڕەوش دیاریکراوە، لە ئامێرە ناوە سووتەکاندا بەکاردێت بۆ نەرمکردنی جووڵەی بزوێن و قەدەغەکردنی داخوران و لابردنی ئەو خەوشانەی لەسووتاندن پەیدا دەبن.

## (N)

naphtha (N) — ٢٨٤- **نفتا ( ن )**

**نەفتا ( نەڤثا )**

**تێکەڵێکی هایدرۆکاربۆنە تێرە پلەی کولاَن نزمەکانە (٩٥ - ١٥٠) ° س، کە لە کردەکانی دڵۆپاندنی نەوت پەیدادەبن.**

naphtha sulphonate — ٢٨٥- **سلفونات النفتا**

**گۆگردات ( سەلفۆنات ) ی نەڤثا**

**ئەو ئاوێتانەن کە لەنەڤثاو ترشی گۆگردیکی دووکەڵدار، پەیدادەبن و ئەستەری هایدرۆ کاربۆنیی ترشی گۆگرد یکن .**

naphthene hydrocarbone — ٢٨٦- **هید روکربون نفتینی**

**نەڤثینە هایدرۆکاربۆن**

**ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنە (کاربۆن و هایدرۆجینە ) ، شێوگە گشتییەکەی(N CN H٢) ە، پێکهاتەی ئەڵقەیی تێری تێدایە.**

naphthenic fraction raffinate — ٢٨٧- **جزْ النفتا المكرّر**

**بەشەنەفپای دووبارە پالێوراو**

naphthenic fraction raffinate — ٢٨٨- **أرصدة النفتا**

**سەرمایەی (کۆکراوەی پاشەکەوتی ) نەفثا**

naphthalene — ٢٨٩- **الفثالين**

**نەڤثالین**

**ئاوێتەیەکی هایدرۆ کاربۆنیی ئارۆماتییە، بەیەکگرتنی دووئەڵقەی بەنزۆل پێك دێت ، شێوگەکیمیاییەکەی ($C_{10}H_8$)ەوهاڕدراوەیەکی سپییە، بۆنێکی تایبەتی هەیە ولەبۆیەسازیدا بەکارد یٚت .**

natural gas — ٢٩٠- **غاز طبيعي**

**گازی سروشتی**

**گازێکە، لەناخی زەوی دەردەهێنرێت لەو ناوچانەدا کە نەوتیان تێدایە و تێکەڵێکی هایدرۆ کاربۆنە گازییەکانە وەك میپان و ئیپانوپرۆپان و بیوتان، هەر وەك دەشێت هەڵمی هەندێ شلە نەوتییە پلەی کولاَن نزمەکانیشی تێدا بێت.**

natural gas liquids **٢٩١- سوائل الغاز الطبيعي**

**شلەکانی گازی سروشتی**

**ئـەو تێکەڵـە هایـد رۆکـاربۆ نییـە شـلانەن کـە لـە نەوتەلأنەکانـدا گـازن، بـەلأم بەخەستکرد نەوە یان ڕومژین دەردەهێنرێن.**

natural gasoline **٢٩٢- الجازولين الطبيعي**

**گازۆلینی سروشتی**

**یەکێکە لەو سووکە دلۆپێنراوە نەوتییانەی تێکەڵە بە گازی سروشتی بەشێوەی هەڵم لەناخی زەویدا و بە پەستاوتن لێی جیادە کرێتەوە و دە بێت بەشل (شل دە بێتەوە) جیادە کرێتەوە و دەدلۆپێنرێتە وە.**

# (O)

octane research — ٢٩٣- بحوث اللأ كتان

**لێکۆڵینەوە کانی ئۆکتان**

ئەو لێکۆڵینەوانەن کە لەسەر سووتەمەنی دەکرێن، بۆ بەرزکرد نەوەی ئۆکتانە ژمارەکەی.

oil layer — ٢٩٤- طبقة النفط

**چینی نەوت**

ڕۆنی کۆبووەوەی ناوەچەیەکی دیاریکراوە لەناخی زەویدا.

oil resources — ٢٩٥- موارد  نفطية

**سەرچاوەی  نەوت**

بڕە نەوتە هەڵگیراوەکانی ناخی زەوی و ئەوەی لێی دەردەهێنرێت.

oil shipments — ٢٩٦- شحنات النفط

**بارە نەوتەکان**

ئەو بڕە نەوتانەن کە لە سەرچاوەکانیان بارده کرێن.

oil tanker — ٢٩٧- ناقلة النفط

**نەوت گوێزەرە وە**

کەشتییەکی گەورەیە، تەنکیی زۆرگەورەی تێدایە، کەخاوی نەوت لە نەوتەلاّ نەکانەوە دەگوێزێتەوە بۆ پالاّوگەو پیشەسازاند نی.

olefin — ٢٩٨- أوليفين

**ئۆلیفین**

هایدرۆکاربۆنێکی ئەلیفاتییە، بەندێك، یان زۆرتری دوانیی تێدایە.

oleic acid — ٢٩٩- حمض أولييك

ترشێکی ڕۆنیی (ڕۆنە ترشێکی) ناتێرە، شێوگی کیمیاییەکەی ($C_{17}H_{33}COOH$)ە، لەئاودا ناتوێتەوە، لەکهول وئیثەردا دەتوێتەوە و لە ڕۆنە ڕووەکی و گیانەوەرییە کانداهەیە.

**٣٠٠- طرائق التشغيل** operating practices

**ڕێگەکانی ئیشپێکردن**

ڕێگە ئیشپێکرد نەناسراوەکانە لەناوکارگەدا.

**٣٠١- مخارج** outlets

دەرچەکان : دەرچەی لاوەکین، گازو شلەکانی لێوەدێتەدەرێ.

**٣٠٢- افاضة الصهريج** over filling atank

سەر ڕێژکردنی تەنکی (تەنکەر).

# ( P )

٣٠٣- **اختبار بنسكي مارتنز بالكأس المغلقة** Pensky Martens closed – cup Test

**تاقیکرد نەوەی پێنسکی مارتینز بەدە فری داخراو**

دیاریکردنی پنتی درەوشە، کە شلەکەی تێدا دادەنرێت لە دەفرێکی داخراودا و گەرم دەکرێت و ئەوسا هەڵمەکان جاروبار دەخرێتە گڕێکەوە.

٣٠٤- **الكيميائيات النفطية الوسيطة** petrochemical inter – mediates

**نەوتە کیمیامەنییە نێوانییەکان**

ئەو کیمیامەنییانەن کە لەنەوت پەیدا دەبن و لە دروستکردنی هەندێ ماددەی تردا بەکاردێت.

٣٠٥- **منتجات النفط** petroleum products

**بەرهەمەکانی نەوت**

**ئەو مادانەی لەنەوت پەیدادەبێت، پاش دڵۆپاندن و پیشەسازاندنی.**

٣٠٦- **تكنلوجيا النفط** petroleum technology

**هونەری ( تەکنۆسازی ) ی نەوت**

ئەولقەی زانستە، کە پەیوەستە بە دەرهێنان و پوختەکردنی نەوت و وەرگرتەکانی وپیشەسازاند نیانەوە.

٣٠٧- **دعائم الاَنابيب** pipe supports

**کۆڵەکەی بۆرییەکان**

ئەو کۆڵەکەیان لەو چوانەن کە دادەچەقێنرێن بۆ بۆری هەڵگرتن.

٣٠٨- **محقنات الفوسف** phosphate injectors

**لێدراوەکانی فۆسفات**

ئەو بۆرییانەن کەگیراوەی فۆسفاتیان پیێ لێ دەدرێت.

٣٠٩- **مصنع تجريبى** pilot plant

**شوێنکاری تاقیگەیی**

شوێنکارۆکەیەکە، ئەندازەی بچووک ئامێری بەکارهێنراوی هێڵی پیشەسازاندنی تێدایە و لێکۆڵینە وەوتاقیکردنەوەی نیوە پیشەسازیی تێدا ڕوودەدات.

pilot testing — ٣١٠- اختبار تجريبي

**تاقیکردنەوەی ئەزموونی (کردەیی)**

جێبەجێکردنی یەکێکە لەو تاقیکردنەوانە، کە بۆ ڕێنمایی دروستی وگونجاویی ئامێریان کردەی پیشەسازی بەکاردێت.

plant area — ٣١١- موقع المصنع

**شوێنی کارگە**

ئەو شوێنەی کارگە داگیری دەکات.

plat – formate — ٣١٢- محسّن بالبلاتين

**پلاتینسازیکراو**

بەنزینی لەبەشی پلاتینسازیکراودا چارەکراو، بۆ بەرزکردنەوەی ئۆکتانەژمارە کەی. کۆمەڵە ئامێرێکە، بەنزینی تێدا چاکسازی دەکرێت بەپەستان و گەرمی بەبوونی هاندەری پلاتین.

plat – former — ٣١٣- وحدة التحسين البلاتيني

**بەشی پلاتینسازی**

٣١٤- وحدةمعالجة بالرصاص (كبريتيد الرصاص)

plumbum sulphide treatingunit (pbS)

**بەشی قورقوشمسازی (گۆگردیدی قورقوشم)**

بەشی چاکسازیی شلە نەوتییەکان و پوختەکردنی خەوشەکانی گۆگرد لێیان بۆ پێکهێنانی گەردێکی لەچاوخۆدا گەورە.

pneumatic control system — ٣١٥- جهاز تحكم هوائي

**ئامێرێکی دابینکرد نی هەوایی**

ئامێرێکی دابینکردنە، بەهەوای پەستێوراو کاردەکات.

peneumatic tool — ٣١٦- أد وات ضغط هوائية

**کەلوپەلی پەستاوتنی هەوایی**

ئەو ئامێرانەن کە بەپەستاوتنی هەواکار دەکات.

polmerisation — ٣١٧- بلمرة

**پەلەرێن**

کۆکردنەوەی ژمارە یەکی زۆر گەردی بچووك بۆ پێکهێنانی گەردێکی لەچاوخۆدا گەورەیە.

٣١٨- هيدروكسيد البوتاسيوم potassium hydroxide

هايدرۆكسيدی پۆتاسیۆم

تفتێكی نائەندامییە، شێوگە كیمیاییەكەی ( KOH) ە.

٣١٩- صهريج متنقل portable tnak

تەنكەری گەڕۆك

تەنكەرێكە، دەتوانرێت لەشوێنێكەوە بجوولێنرێت بۆ شوێنێكی تر بەهۆكای جیاواز.

٣٢٠- زيت محَرك ممتا ز premium motor oil

ڕۆنی بزوێنی نایاب

ئەو ڕۆنەیە، كە لەبزوێنە ڕەوش تایبەتەكاندا بەكاردێت و وای لێ دەكات لەڕۆنەكانی تر چاكتر بێت.

٣٢١- تدبير لحفظ الضغط pressure conserration meausure

ڕێكخستن بۆ پاراستنی پەستان

یەكێكە لەو هۆكارانەی لە جێگیر پاراستنی پەستاندا بەكاردێت.

٣٢٢- عملية process

كردە

كۆی ئەو قۆناغە جیاوازانەیە، كەبەر هەمهێنراوێكی پێدا تێ دەپەڕێت.

٣٢٣- مادة مصنعة processed material

مادده یەكی دروستكراو

ئەو ماددەیە یە، كە بەهەندێ قۆناغی پیشەسازاندندا تێپەڕیوە و شێوە گربووە.

٣٢٤- مخطط سير التصنيع process flow diagram

نەخشەی ڕەوتی پیشەسازاندن

نەخشەیەكە، قۆناغە جۆربەجۆرەكانی پیشەسازاندن و جوولەی مادده بە شدارەكانی كردە پیشە سازییەكان ڕوون دەكاتەوە.

٣٢٥- حصيلة الانتاج product yield

دەسكەوتی بەرهەمهێنان

بڕی مادەی پەیدابووە، یان بەقەبارە، یان بەكێش، یان وەك ڕێژەی سەدی قەبلێنراوەو دەردەبڕدێت.

٣٢٦- جدول تقدم العمل — progress schedule

**خشتەی پێش کەوتنی کار (ئیش)**

ئەوکاتە بەرنامەیەیە کە پێشکەوتنی ڕەوتی کار لەکاتی کردە جیاوازەکاندا ڕوون دەکاتەوە.

٣٢٧- قطران البروبان — propane tar

**قەترانی پرۆپان**

ئەوقەترانەیە، کەلە دروست کردنی پرۆپان پێك دێت.

٣٢٨- مضخة تنسيب

**ترومپای ڕێژاندن (ڕێژەکاری)**

ترومپایەکە، لەکردەکانی تێکەڵکاری بەڕێژەیەکی نەگۆڕدا بەکاردێت.

٣٢٩- الأسواق المتوقعة — prospective markets

**بازارە پێشبینیکراوەکان**

ئەو شوێنانەی چاوەڕوان دەکرێت بەرهەمەکان بازاڕسازی بکرێت.

٣٣٠- تفريغ بالضخ — pump – out

**بەتاڵکردن بەڕژاندن**

بەتاڵکردنی گەنجینەیەك (تەنکییەك) لەوشلەی کە تێیدایەتی، بەبەکارهێنانی ترومپا.

٣٣١- ضخ — punping

**ڕژان، هەڵهێنجان**

پاڵپێوەنانی شلەکان بەهۆی ترومپاوەو بەتاڵکردنی تەنکییەك لەوشلانەی کەتێییدایەتی بەبەکارهێنانی پەمپ.

٣٣٢- ڕۆنی ئاودان — quenching oil

ئەو ڕۆنەیە کە لەکردەکانی کوت و پڕساردکردنەوەدا بەکاردێت.

# ( R )

reaction chamber ٣٣٣- **غرفة التفاعل**

**ژووری كارلێككردن ( كارلێك )**

**ئەوشوێنەیە، كردەكانی پیشەسازاندن، یان كارلێكی سەرەكی تێدا ڕوودەدات.**

reciprocating pumps ٣٣٤- **مضخات تردّدية**

**ژەندنە ترومپا ( ترومپای هاتوچۆكەر )**

**ئەو ترومپایانەن، كەیارمەتی پاڵپێوەنانی شلەكان دەدەن بەهەر دوولادا (بۆ پێشەوەو بۆپاشەوە) بەئاڵوگۆڕ .**

recording unit ٣٣٥- **وحدة تسجيل**

**بەشی تۆمار كردن**

**بەشی تۆماركردنی پێوان بەشێوەی ڕەنووس، یان چەماوەكان وەك لەئامێرەكانی پێوانی شەبەنگدا.**

rectiflow extraction process ٣٣٦- **عملية الاستخلاص بالسريان المستقيم**

**كردەی پوختەكردن ( دەرهێنان ) بەڕەوینی ڕاست**

**كردەیەكی پوختە كردنە، شلەكۆكراوەكانی تێدا پاڵ پێوە دەنرێت و، دەرهێنانی لەكاتی ڕەوینەكەدا ڕوودەدات .**

recycle ٣٣٧- **إعادة االدورة**

**سووڕاندنەوە كاری**

**گێڕانەوەی هەندێ بەرهەمە كردەیەك بۆ سەرەتای ئەوخولە پیشەسازییەی لێوەی دەستی پێ كردووە .**

recyle pump ٣٣٨- **مضخات الدورة المستمرة**

**ترومپای خولە بەردەوامەكان**

**ئەوترومپایانەی شلەكان دەڕێژن لەخولێكی داخراودا .**

refined products ٣٣٩- **منتجات منقاة**

**بەرهەمەخاوێنكراوەكان ( پوختە كراوەكان )**

**ئەو بەرهەمانەن كەیان بەڕێگەی سروشتی پوختەكراون، یان بەڕێگەی كیمیایی، كە بەزۆری ڕەوشی تایبەتییان هەیە.**

٣٤٠- توقف مصنع التكرير refinery shut down

وەستانی کارگەی پاڵزنێن ( پوختەکردن )

وەستانی کردە جۆراوجۆرەکانی دروست کردن، لەناوپاڵێوگەدا.

٣٤١- زيت وقود التكرير (التصفية) refining fuel oil

ڕۆنی سوتەمەنیی پوختەکردن ( پالاَوتن )

ڕۆنی بۆ گەرمکردن بەکارهێنراو، لەکردەکانی پوختە کردندا.

٣٤٢- سائل مُرتَدّ reflux

شلێکی گێڕدراوە

ئـــەو هـــەڵمی شـــلەگەرمانەیە، بەســـاردکرنەوە خەســـت دەبێتـــەوە لەساردکەرەوەیەکدا و جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ دەفری کارلێکە کە .

٣٤٣- المُحسّن reformate

چاککراو، چاکسازیکراو

شلی پەیدا بوو لەکردەی چاکسازیی بەنزین بەگەرمی وپەستان .

٣٤٤- وحدة التحسين reforming unit

بەشی چاکسازی

کۆمەڵە ئامێرێکە، لەچاکسازیی ڕەوشی بەنزین بەپەستان و گەرمی بەکاردێت .

٣٤٥- غاز مثلج refrigerated

گازی بەفرێنراو ( ساردکراوە )

گازێکی ساردکراوەیە، پلەی گەرمییەکەی تاژێرسفری سەدی نزم کرابێتەوە .

٣٤٦- وحدة تزويد الوقود refueling unit

بەشی سووتەمەنی پێدان

کۆمەڵە ئامێرێکە، بۆ سووتەمەنی پێدان بەکاردێت.

٤٣٧- فرن إعادة تسخين reheat furnace

فڕنی ( کوورەی ) گەرمکردنەوە

فڕنێکە، بۆریی هەندێ شلی نەوتیی پێداتێ دەپەڕێت، بۆ بەرزکردنـەوەی پلـەی گەرمیی ئەوشلانە بۆپلەیەکی بەرزتر و ئاسانکاریی دڵۆپاندنەوەیان .

٤٣٨- محطة وسيطة relay station

نێوانە بنکە ( ناوەند )

ناوەندێکـە، شـەپۆلە بێتـەل، یـان شـلەکان وەردەگرێـت ئـەوجا دەینێرێتـەوەو بەهێزی دەکات .

**٣٤٩- التحكم من بعد** remote control

**لەدوورەوە دابینکردن**

چاودێریی هەندێ کردەی پیشەسازی و لەدوورەوە دابینکردن و ڕێکخستنێتی بەهۆی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانەوە.

**٣٥٠- شعبة البحوث** research section

**کەرتی تۆژینەوە**

ئەو بەڕێوە بەرێتییە تایبە تییەیە کەلە چاکسازی و گەشەپێکردنی بەرهەم دەکۆڵێتەوە.

**٣٥١- وحدة التكسيرالهيدروجيني للرسابة** residue hydrocrack-ing unit

**بەشی هایدرۆتێکشکاندنی پاشەڕۆ .**

کۆمەڵە ئامێرێکە، بۆ چارەسەری ڕۆنە قورسە جۆراو جۆرەکان بەکاردێت بۆ گۆڕینیان بۆ شلی پلەی کولاّن کەمترو دەتوانرێت بۆ زۆر مەبەست بەکاربهێنرێت .

**٣٥٢- هدرجة الرسابة** residue hydrogenation

**هایدرۆجینینی پاشەڕۆ**

مامەڵەکردنی ڕۆنە قورسە پاشماوەکان بەهایدرۆجین، بەبوونی هاندەرێك.

**٣٥٣- مُحتجَز** retainer

**هێڵەرەوە، گلدەرەوە**

ئامێرێکە، بەشێکی شل، یان خەوشە پاشماوەکان گل دەداتەوە و لەبەشەکانی تریان جیادەکاتەوە.

**٣٥٤- زيت غنى** rich oil

**ڕۆنی دەوڵەمەند ( فرە یان بە پیت )**

ڕۆننەوتێکە، ڕێژەیەکی زۆری ئەو سووکە دلۆپاوانەی تێدایە، کە بۆ سووتەمەنی بەکاردێن و ڕێژەیەکی کەمی دلۆپاوە قورسەکان تێدایە .

**٣٥٥- اختبار ممطولية الزيت** ring and ball (R& B) ductility

**تاقیکردنوەی ملێتیی ڕۆن**

تاقیکردنەوەیەکە، بۆ دیاریکردنی لینجیی و ملێتیی ڕۆن، بە ئەڵقە و تۆپ بەکاردەهێنرێت.

# ( S )

٣٥٦- لفح الرمال	sand blasting

لمە پرژاندن

ئاراستەکردنی لمە، لەژێر پەستانی هەوادا بۆ ڕووەکانزاییەکان، بۆ لابردنی ئەو خەوشـانەی کـە پێیانـەوە گیرسـاوەتەوە، لابردنـی بەڕێگـەی تـر گرانـە و بۆپاکردنەوەی کانەکان بەکاردێت

٣٥٧- جهازسيبولت ( للتلوين )	saybolt for colouring

لینجبیپێو، ئامێری سێبۆڵت ( بۆڕەنگکردن )

ئامێرێکە، بۆ دیاریکردنی لینجیی ڕۆنەکان بەکاردێت .

٣٥٨- تكبير	scaling up

گەورەکردن

چەند جار جێبەجێکاریی ئەوتاقیکردنەوانەیە، کە لەکارگەی تۆژینەوەکاندا جێبەجێ دەکرێت، بەشێوەیەکی زۆرتر.

٣٥٩- مسحوق تنظيف	scouring powder

تۆزی پاككردنەوە

هاڕدراوەیەکە، لەپاككردنەوە یان لێ لابردنی پیویان پەڵە لە ڕووی کانزاکان.

٣٦٠- مرشحات	screens

پاڵێوەکان

ئەو ئامێرانەن کە گیرساوەکان لەگازیان شلەکان جیا دەکەنەوە.

٣٦١- جهاز غسل الغازات	scrubber

ئامێری شتنی گازەکان، بەگازشۆر

کەلویـەکی پێکهـاتن تایبەتـە، گازەکـان لەدامێنیـەوە دەچنەناوی و ڕووبـەڕووی پرژەی ئاویان ڕۆنی تایبەتی دەبنەوەو خەوشەنە خوازراوەکانیان لێ لادەبات.

٣٦٢- أنابيب غير ملحومة	seemless pipes

بۆرییەنەلکێنراوەکان

ئەو بۆرییانـەن، کە لـە (تەبەقە) کـانزا بـە نوشـتاندنەوەو لکانـدن (لـەحیمکردن) دروست نەکراون وساف وبێ لێوارن.

**٣٦٣- عربةنقل معلقة** sky hook

**عەرەبانەی گواستنەوەی هەڵواسراو**

عەرەبانەیەکی گواستنەوەی لەسەرتەلی هەڵواسراو جووڵۆکە، خاوەکانی تێدا دەگوێزرێتەوە.

**٣٦٤- مواد رخوة** slack materials

**مادده سستەکان ( خاوەکان )**

نەوتە بەرهەمە چڕی بەرز، یان نیوە بەستووەکانە، وەك مێو، ئەم بەرهەمانە بەهێواشی بەبۆرییەکاندا دەجووڵێن.

**٣٦٥- سقاطة** sludge

بەقوڕو پیو وهەر پاشەڕۆیەکی تری خەست دەڵێن.

**٣٦٦- ذوبانية** solubitity

**توانەوە یێتی، توانستی توانەوە**

توانستی توانەوەی ماددەیەکە، لە توێنەرێکدا، لەپلەیەکی گەرمیی دیاریکراودا.

**٣٦٧- نزع الشمع بالمذيبات** solvent dewoxing

**مێولێکردنەوە بەتوێنەر**

پوختەکردنی ڕۆنە لەتوێنەرەوەکان.

**٣٦٨- التكرير بالمذيبات** solvent refining

**بەتوێنەر پوختەکردن**

جیاکردنەوەی هەندێ پێکهێنەر، بە پوختەکردنی بەهۆی توێنەرەوە.

**٣٦٩- سناج** soot

**تەنی سووتو**

وردیلەی کاربۆنی پەیدابوو لەسووتاندنی هەندێ ماددەی ئەندامی، کە لە سەر ڕووە کانزاییەکان دەنیشێت.

**٣٧٠- الغاز الحامض** sour gas

**ترشە گاز**

ئەو گازە سروشتییەیە، کە بڕێکی زۆر نائاسایی گۆگردو ئاوێتەکانی تێدایە.

**٣٧١- النفط الحامض** sour oil

**ترشه نەوت**

نەوتێکی خاوە، بڕێکی زۆر نائاسایی گۆگرد و ئاوێتەکانی تێدایە.

**٣٧٢- الثقل النوعی** specific gravity

**قورسایی جۆری**

ڕێژەی نێوان کێشی ماددە و کێشی هەمان قەبارە ماددەیەکی پێوانەیی ترە، لەباری شلەکاندا، بەپێی ئاو دەردەهێنرێت، کە ئاسایی بەجۆرە چڕی، یان جۆرە خەستی (خەستیی جۆری ) ناسراوە.

**٣٧٣- وحدة المثبت** stabilizer plant

**بەشی جێگیرکەرە**

چەند ئامێرێکن هەندێ کارلێکی کیمیاییان تێدا ڕوودەدات بەبوونی هۆکارێکی جێگیرکەر.

**٣٧٤- المعدلات القیاسیة** standard ratios

**تێکڕا پێوانەییەکان**

١-تێکڕای کاریان شێوازەئیش پێکردن.

٢- نرخە پێوانەییەکان.

**٣٧٥- البدء** start up

**دەستپێکردن**

دەستپێکردنی ئیشپێکردن

**٣٧٦- الضغط الآستاتیکی** static pressure

**جێگیرە پەستان**

پەستانێکی جێگیر لە ماوەیەکی دیاریکراوی کاتدا.

**٣٧٧- طَرْق بخاري** steam hammering

**هەڵمە کوتان**

١-کوتان بەمێکوتێکی ئامێریی بەهەڵم گێڕدراو .

٢- ئاراستەکردنی فوارەیەکی فرەگەرمی هەڵم لەسەر ڕووی ئاو.

٣٧٨- **قميص بخار** steam jacket

**هەڵمەكراس، كراسەهەڵمینە**

جووتە دیواری هەندێ ئامێر كە هەڵمی

٣٧٩- **فصل البخار** steam stripping

**جیاكردنەوەی هەڵم**

لابردنی شلەپلەی كولاَن نزمەكان لەڕۆنەكانی تر بەگەرمكردن، یان بەڵمی فرەگەرم .

٣٨٠- **مصایر البخار** steam traps

**هەڵمەتەڵە**

ئەو ئامێرانەن كە خەستكردنەوەی هەڵم و جیاكردنەوەی لەشلەكانی تر یان تێدا ڕوودەدات

٣٨١- **مخزون** stocks

**هەڵگیراو**

ئەومادانەی ماوەیەك هەڵدەگیرێن (پاشەكەوت دەكرێن)

٣٨٢- **التقطیر العادي** straight run

**دڵۆپاندنی ئاسایی**

وەسفی ئەو دڵۆپێنراوانەیە كە لە دڵۆپاندنی ئاسایی خاوی نەوت پەیدادەبن .

٣٨٣- **جهاز إزاله البیوتان بالتقطیرالعادی** straight run de – butaniser

ئامێری لابردنی بیوتان بەدڵۆپاندنی ئاسایی

٣٨٤- **تدفق إنسیابي** stream line flow

**ڕەوینە دەرپەڕین**

وەسفی ڕەوینی شلەكانە بە ئاسانی وبێ گیروگرفت.

٣٨٥- **الفاصل جهاز الفصل** stripper

**جیاكەرە ئامێری جیاكردنەوە**

ئامێرێكە، لابردنی بەشەسووكە پلەی كولاَن نزمەكانی لەهەندێ ڕۆنی وەك ڕۆنی چەوركردن تێدا ڕوودەدات بەهۆی هەڵمی فرەگەرمەوە و هەندێ جار داماڵ لێكەرەوەی لەشێوەی ستوونێكی دابەشكردنی بچووكدا دەبێت.

stripping
٣٨٦- فصل

**جیاکردنەوە**

لابردنی شلەپلەی کولاَن نزمەکانی لەڕۆنەکان تر، بەگەرم کردن، یان بەهەڵمی فرە گەرم تێداڕوودەدات.

styrene
٣٨٧- ستيرين

**ستایرین**

ئاوێتەی ستایرینی نەبلوریو، کە ئاوێتەیەکی هایدرۆ کاربۆنییە، ئەڵقەیەکی بەنزین و بەندێکی ناتێری تێدایە.

sub station
٣٨٨- محطة فرعية

**بنکەیەکی لاوەکی**

ناوەندێکی ناوەنجییە.

suction end
٣٨٩- طرف المص

**کەناری مژین**

کۆتایی هێڵە بۆریەکان، یان ئەو ئامێرانەی گاز و شلەکانی تێدا ڕادەکێشرێنە دەرەوە.

suction line
٣٩٠- خط المص (الشفط)

**هێڵی مژین (مژین)**

ئەو هێڵە بۆرییانەیە بۆ ڕاکێشانی شلەکان و بەتاڵکردنەوەی تەنکییەکانی هەڵگرتن بەکاردێن

sulpher
٣٩١- الكبريت

**گۆگرد**

توخمێکی ناکانزای بەستوی زەردی ئاسان شکاوە، گەردیلە ژمارەکەی (١٦) یەکێشی گەردیلەییەکەی (٣٢،٠٦)ە.

sulpher content
٣٩٢- المحتوى الكبريتي

**گۆگردە ناوەرۆك**

بڕی ئەوگۆگردەیە، کەلەماددە ئەندامییەکاندا هەیە، وەك شلە نەوتییەکان کە بەزۆری بەشێوەی ڕێژەی سەدی دەبێت.

٣٩٣- استخلاص الكبريت sulpher recovery

**پوختەکردنی گۆگرد**

کردەیەکی تایبەتە، گۆگردی پێ دەردەهێنرێت لەو ئاوێتە ئەندامییە گۆگردییانەی پێشتر لە دلۆپێنراوەکانی نەوت دەرهێنراون.

٣٩٤- دعامات supports

**کۆڵەکەکان**

پەیکەری کانزایی، یان ئەو کۆڵەکانەیە کە هێڵەکانی بۆری یان ئامێرەکانیان هەڵگرتووە.

٣٩٥-صهريج الفائض surge tank

**تەنکی سەررێژکردوو**

تەنکییەکە، زیادەی ئەوسەر ڕێژەیەکە لە یەکێك لە هێڵەکانی بەرهەمهێنانەوە دەڕوات، کۆدەکاتەوە.

٣٩٦- المياة العالقة suspended water

**ئاوی گیرساوە**

ئەوئاوەیە، کەوەك گیرساوەیەك دەردەکەوێت لەیەکێك لە دلۆپێنراوەکانی نەوت.

٣٩٧- تخليق synthesis

**دروستکردن، فەراهەمکردن**

پێکهێنانی ئاوێتەیەکە لەتوخمەکانی، یان لەبەشی پێکهێنی بچووك.

٣٩٨- خام مخلق synthetic crude

**خاوی دروستکراو، فەراهەمکراو**

خاوێکی بەڕێگەیەکی پیشەسازی دروستکراوە.

# (T)

٣٩٩- **مقياس الجريان ( تاكو متر )** tachometer

**ڕەوینپێو، پێوەری ڕەوین**

**ئامێرێکە، خێرایی ڕەوینی شلەکان بەبۆرییەکانیاندا دیاری دەکات بەپێوانی ژمارەی سووڕەکان (خولەکان) لەدەقیقەیەکدا**

٤٠٠- **خامات حسب الطلب** tailored crude

**خاوی بە پێی داخوازی**

**خاوێکە بەپێی ڕەوشی تایبەتی ئامادەکراو.**

٤٠١- **حقل الصهاريج** tank farm

**شوێنی تانکەرەکان ( تەنکییەکان )**

**ئەو ڕووبەرەیە کە بۆتەنکییەکانی هەڵگرتنی نەوت تەرخان کراوە.**

٤٠٢- **قدور القطران** tar pots

**مە نجەڵەکانی قەتران**

**ئەودەفرانەن، کە قەترانیان تێدا هەڵدەگیرێت.**

٤٠٣- **منظم الحرارة** tempature controller

**پلەی گەرمی ڕێکخەر**

**ئامێرێکە، بۆ ڕێکخستنی پلەی گەرمی، یان جێگیرکردنی لەسنوورێکی دیاریکراودا بەکاردێت.**

٤٠٤- **نهاية** terminal

**کۆتایی**

**کۆتایی هێڵەکانە.**

٤٠٥- **تشغيل اختباري** test run

**ئیشپێکردنی ئەزموونی**

**جێبەجێکردنی یەکێك لە ئیشپێکردنەکان، یان بەڕێوەبردنی یەکێك لەئامێرەکان بۆ تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی.**

٤٠٦- رُباعي أثيل الرصاص tetraethyl lead

چوارەئەثیلی قوڕقوشم

ئاوێتەیەکی ئەندامییە، لەچوار کۆمەڵە ئەثیلی بەگەردیلەی قوڕقوشمەوە بەستراوپێك دێت، شێوگە کیمیاییەکەی $(C_2H_5)_4Pb$و وەك یەکێك لەو مادانە بەکاردێت کە دەکرێنە گازۆلینەوە بۆ بەرزکردنەوەی ئۆکتانە ژمارەکەی

٤٠٧- تترامر tetramer

تێترامەر

پۆلیمەرێکە، بۆ کۆکردنەوەی چوارگەردی ئاوێتە بنەڕەتییەکە پێك دێت.

٤٠٨- تكسير حراري thermal cracking

گەرمەتێکشکان

تێکشکاندنی هەندێ دڵۆپێنراوی بەرزە کوڵ بۆ دڵۆپێنراوی سووك بەبەکارهێنانی گەرمی و پەستان.

٤٠٩- إصلاح حراري thermal reforming

گەرمە چاکسازی

چاکسازیی ڕەوشتی دڵۆپێنراوەکانی نەوتە، بەبەکارهێنانی گەرمی وپەستان.

٤١٠- وحده التحسين بالحراره thermal reforming

بەشی گەرمەچاکسازی

ئەو کۆمەڵە ئامێرەیە، چاکسازیی دڵۆپێنراوەکانی نەوت و چاکسازیی ڕەوشتەکانی بەبەکارهێنانی گەرمی تێدا ڕوودەدات.

٤١١- الثبات الحراري thermal stability

گەرمەجێگیری

توانستی مادده بۆ بەرگری کاریگەریی گەرمی.

٤١٢- مزدوج حراري thermocouple

جووتەی گەرمی

ئامێرێکە بۆ پێوانی پلەی گەرمی بەرزو لەدووتەلی بەریەککەوتەی دوو کانزای جیاواز پێك دێت، پلەی گەرمی بەپێوانەی ئەو تەزوی کارەبایەی لە پنتی بەریەککەوتندا پەیدادەبێت، دەقەبڵنرێت.

toluene ٤١٣- طولوين

تۆلوين

یەکێکــە لــە هاودەمــەکانی بــەنزۆل، شــێوگە کیمیاییەکــەی ($C_6H_5CH_3$)ە وشلێکی بێڕەنگە بۆنێکی تایبەتی هەیە، (١١٠) س دا دەکولێت و وەك توێنـەر بەکاردێت، هەروەك لەپیشەسازیی نایترۆتۆلوینی توند تەقاوەدا بەکاردێت .

top up ٤١٤- افعام

لێوانلێوکردن

پڕکردنی دەفر تالێوەکەی.

traces ٤١٥- آثار - آثارات

شوێنەوار

پاشماوە زۆربچووکەکانی کەلە ماددەیەك دەمێنێتەوە.

transformer oil ٤١٦- زيت المحوّلات

ڕۆنی بگۆڕەکان

ڕۆنێکــە، ڕەوشـــی تایبـــەتی هەیـــە و جێگیرێکـــی دابڕێنـــی بـــەرزی هەیـــە لەپڕکردنەوەی بگۆڕە کارەباییەکاندا بەکاردەهێنرێت.

treating tower ٤١٧- برُج المعالجة

کەلوی چارەکردن

کەلویەکــە، کردەکــانی چاکســازیی ڕەوشــتەکانی شــلە نەوتییــەکانی تێــدا جێبەجێ دەکرێت.

trunk line ٤١٨- خط رئيس

هێڵی سەرەکی

هێڵی بنچینە .

typical process ٤١٩-عملية نموذجية

کردەیەکی نموونەنی

کردەیــەکی پیشــە ســازییە، تــاقی کراوەتــەوەو ســنوورەکەی دیــاریکراوەو وەك نموونەیەکی کردە لەوچووەکانی (هاوشێوەکانی ) وەردەگیرێت.

## ( U )

٤٢٠- **غيرتام التصنيع** unfinished manufactured

**دروستكردنى ناتەواو**

ئەو ماددەيەى هێشتا پوختەكردن و سازكردنى تەواونەبووە.

٤٢١- **وحدة** unit

**يەكە، ئەندازە، بەش، ...**

زاراوێكە، لەپيشەسازيدا بە كۆمەڵ ئامێرێك دەڵێن كە كردەيەكى پيشەسازى دياريكراويان پێ جێبەجێ دەكرێت، وەك بەشى شكاندن و بەشى دڵۆپاندن.

٤٢٢- **عملية موحّدة** unit operation

**كردەيەكى يەكگرتوو**

وەسفێكى كردەى فيزيايى دياريكراوە وەك دڵۆپاندن، يان پالأوتن و لە هەموو ئەو هۆكارانەى كاردەكەنە ڕوودانى ئەم كردانە دەكۆڵنەوە.

٤٢٣- **رفع الرتبة** up grading

**پلەبەرزكردنەوە**

بەرزكردنەوەى پلەى ماددە وچاكسازيى جۆرەكەى، يان بەپوختە كردن، يان بەلابردنى هەنديك لەپێكهاتەكانى.

٤٢٤- **مقدم التيار** up stream

**پێشى تەوژم**

زاراوێكە، قۆناغە لەپنتى سەراتاييەكەوە نزيكترەكەى لەكردەى پيشەسازاندنى نەوتدا پێ وەسف دەكرێت.

## (V)

٤٢٥- مضخة فراغية vacuum pump

ترومپای بۆشەکی

ترومپایەکی، هەوا ڕادەکێشێت و پەستان کەم دەبێت لەناو ئامێرەکاندا.

٤٢٦- مخلّفات التفريغ vacuum residium

پاشەڕۆی بەتاڵکردن

مادده پاشماوەکان پاش تەواوبوونی کردەیی دڵۆپاندن، لە ژێر پەستانێکی کەمدا.

٤٢٧- برج مفرغ vacuum tower

کەلوی بۆش

کەلویەکە، هەواکەی لێدەرکراوە و پەستان لەناویدا کەمترە لە پەستانی هەوا.

٤٢٨- منافذ البخار vapour uptakes

دەرچەکانی هەڵم

ئەو شوێنانەن کە هەڵمیان لێوە دەچێتە ژوورەوە لەکردەی دروستکردندا.

٤٢٩-شدّة متغيّرة variable intensity

تینی گۆڕۆك

ئەو توانست، یان وزەیەیە، کە ناوبەناو دەگۆڕدرێت.

٤٣٠- منفث= مخرج، تهوية vent

کون= دەرچە، باکێش

کونێکی لاوەکییە، بواری چوونە دەرەوەی هەڵم، یان گاز دەدات و یاریدەی هاوسەنگی پەستان دەدات کە جێگیر بێت لەبەهایەکی دیاریکراودا، لەناوبۆری وئامێرەکاندا .

٤٣١- صمام تنفيث vent valve

دەمەوانەی باکێش

دەمەوانەیەکە لەباکێشەکەدا، دادەنرێ، کەیاریدەی کردەی چوونە دەرەوەی گازەکان وپەستان بەجێگیری دەپارێزێت لەبەهایەکی دیاریکراودا .

٤٣٢- **دليل اللزوجة** viscositg index

**بەڵگەی ( ڕێنمایی ) لینجی**

**ڕەنووس، یان بەهایەکە، پلەی لینجی ڕۆنی چەورکرن دیاری دەکات .**

٤٣٣- **مواد متطايرة** volatile matters

**مادده فڕۆکەکان**

**ماددەی پلەی کوڵاَن نزمن و بەئاسانی بەسووکە گەرمکردنێك بەرزدەبێتەوە .**

٤٣٤- **النسبة المئوية للفاقد الحجمي** volume percent loss

**ڕێژەی سەدیی قەبارەکەمکردن**

**قەبارەی شلە ونکراوە،کە وەك ڕێژەی سەدیی لە قەبارەی گشتیی شلەکانەوە دەقەبڵێنرێت.**

## ( W )

٤٣٥- **صهريج الغسل** wash tank

**تەنکیی شتن**

تەنکەریان تەنکیەکە، کردەکانی شتنی گازو شلەکانی تێدا ڕوودەدات بۆ لابردنی خەوشەکانی .

٤٣٦- **التشبّع ببخار الماء** water vapour saturation

**بەهەڵمی ئاوتێربوون**

تێربوونی گاز، یان شل بەهەڵمی ئاو، بەجۆرێك ڕێژەی ئاو تێیدا بگاتە بەرزترین ڕادەی شیاو.

٤٣٧- **عمود تجوية** weathering column

**ستوونی کەشاندن**

کەلویەکە،شلەکان تێیدا دەدرێنە بەر هەوا، بۆ لابردنی ئەو خەوشە گازانەی کە تێیدیە .

٤٣٨- **منصة الوزن** weigh bridge

**سەکۆی کێشان**

جۆرە تەرازوویەکی تایبەتەبۆکێشانیلۆرییە بارهەڵگرەکان وهی تریش .

٤٣٩- **عامل وزن** weighing factor

**هۆکاری کێش**

کێشی ئەو توخمی گۆگردەیە کە لە ماددە ئەندامییەکەدا هەیە کەبەشێوەی ڕێژەی قەبڵێنراوە.

٤٤٠- **النسبة المئوية للكبريت** weight percent sulpher

**ڕێژەی سەدیی گۆگرد**

کێشی ئەو توخمی گۆگردەیە کە لەماددە ئەندامییەکەدا هەیە، بەپێی ڕێژەیی سەدی قەبڵنێراو.

٤٤١- **منتجات عفوية** wild products

**بەرهەمی ڕەمەکی**

بەرهەمی ناوە ، هەندێك جار لە کاتی کردە سەرەکییەکانی پیشەسازاندندا پەیدادەبێت، نەك (بەمەبەستی ) بەرهەمهێنانی .

## ( X )

**٤٤٢- زایلین** xylene

**زایلین**

**یەکەیەکە لە هاوەڵەکانی بەنزۆڵ، کە ئاوێتەیەکی ئارۆماتییە، دووکۆمەڵەی مەثیل لکاون بەناوکی بەنزۆڵەوە ، ئاسایی بەشێوەی تێکەڵی ئۆرثـۆ و میتاو پارا زایلین هەن، کە شلە لەپلەی گەرمی ئاساییدا، لە( ١٣٨ )ە س دا دەکوڵێت و وەك توێنـەر بەکاردێت، هەروەها لەکردەکانی ئامادەکردنی کیمیاییشدا، شێوگە کیمیاییەکەی** $(CH_3)_2$ ( $C_6H_4$ ) **ە** .

## ( Z )

**٤٤٣- کلورید الزن** zinc chloride

**کلۆریدی زینك**

( $ZnCl_2$ ) **ماددەیەکی بلووریوە، ئاسان لە ئاودا دەتوێتەوە، لەکارلێکی کانزای زینك و ترشی هایدرۆکلۆریك ئامادەدەکرێت** .

# A

| | | |
|---|---|---|
| Abbe refractometer | مقياس ( آب ) لمعامل انكسار السوائل | پێوەری ( ئاب ) هاوكۆلكەی شكاندنەوەی شلەكان |
| Absolute | مطلق، صرف | پەتی، ڕەها |
| Absolute age | العمر المطلق | تەمەنی ڕەها |
| Absolute alcohol | الكحول المطلق | كهولی ڕەها ( كهولی پەتی ) |
| Absolute atmosphere | ضغط جوي مطلق | پەستانی پەتیی ڕەها |
| Absolute density | المكثافة المطلقة | خەستیی پەتی |
| Absolute deviation | الا نحراف المطلق | لادانی ڕەها |
| Absolute expansion | تمدد مطلق | كشانی ڕەها |
| Absolute humidity | الرطوبة المطلقة | شێی پەتی |
| Absolute permeability | الانفاذية المطلقة | دادانی ڕەها |
| Absolute scale = kelven scale | مقياس كلفن المطلق لدرجة الحرارة | پێوەری پلەی گەرمیی پەتیی كەلڤن |
| Absolute temperature | درجة الحرارة المطلقة | پلەی گەرمیی پەتی |
| Absolute specific gravity | الوزن النوعي المطلق | جۆرە كێشی پەتی |
| Absolute zero | درجة الصفر المطلق ( ۲۷۳,۲۰۰- م ) | پلەی سفری پەتی ( ۲۷۳,۲۰۰- س ) |
| Absorb | إمتص | مژی |
| Absorbability | أمتصاصية، قابلية الامتصاص | مژۆكی |
| Absorbable | يمتص : قابل الإمتصاص | دەمژرێت : مژۆك |
| Absorption | امتصاص | مژین |
| Absorption econometer | إيكونوميتر امتصاصي : لقياس كمية ثنائي أوكسيد الكربون في غازات الاحتراق | مژینە ئیكۆنۆمیتەر : بۆ پێوانی بڕی دوانۆكسیدی كاربۆن لەگازەكانی سووتاندندا |

| | | |
|---|---|---|
| Absorption plant | وحدة إمتصاص : وحدة إستخلاص البنزين من الغاز الطبيعي | بەشی مژین : بەشی دەرهێنانی بەنزین لەگازی سروشتی |
| Absorption spectrum | طيف الامتصاص | شەبەنگی مژین |
| Abundance | كثرة، وفرة | زۆری، فرەیی |
| Abundant | وافر، غزير | فرە، زۆر |
| Academic | أكاديمي ـ مصطلحي، نظري | ئەكادیمی ـ زاراوەیی، بیردۆزی |
| Accelerant (n.) | معجل التفاعل، مسرع | خێراكەرە، كارلێك تاودەرە |
| Accelerated filteration | ترشيح معجل ( بالضغط ) | پالاوتنی خێراكراو ( بە پەستان ) |
| Accelerated reaction | تفاعل معجل أومسارع | كارلێكی تاودراو یان خێراكراو |
| Accelerometer | مسراع : مقياس التسارع | تاودانپێو : پێوەری خێرابوون |
| Access | سبيل، منفذ، مسلك | ڕێگا، دەرچە، ڕێگا |
| Accessible | سهل المنال | ئاسان دەسكەوتە |
| Accessory | إضافي، ثانوي، لاحق | خراوەسەر، ناوەنجی، پاشكۆ |
| Accessory minerals | معادن ثانوية | كانە ناوەنجییەكان |
| Accretion | تراكم، تجمع | كەڵەكەبوون، كۆوەبوو |
| Accrue | تراكم، تجمع | كەڵەكەبوو، كۆوەبوو |
| Accumulate | ركم، تجمع | كەڵەكەبوو، كۆبووەوە |
| Accumulation | تراكم، تجمع | كەڵەكەبوون، كۆبوونەوە |
| Accumulation of petroleum | تجمع بترولي | كۆبوونەوەی پێترۆڵ |
| Accumulator | مركَم، مُركِّم | كۆوەبوو، كۆكەرە |
| Accumulator battery | بطارية مركمات | باتریی كۆكەرە |
| Accumulator cell | خلية مركَم | خانەی كۆكار |
| Accumulator tank | خزان التجميع | تەنكیی ( گە نجینەی ) كۆكردنەوە |
| Acerbity | حموضة | ترشێتی |

| | | |
|---|---|---|
| Acetaldehyde $CH_3CHO$ | أسيتالديهايد | ئەسیتاڵدیهاید |
| Acetamide $CH_3CONH_2$ | أسيتاميد | ئەسیتەماید |
| Acetate | أسيتات، خلات | ئەسیتات، سرکات |
| Acetic | خلّيَ، أسيتي | ئەسیتی، سرکەیی |
| Acetic acid | الحامض الأسيتي، حامض الخل | ترشی ئەسیتی، ترشی سرکە |
| Acetic anhydride = acetic oxide | أنهيدريد الخلي = أوكسيد الأسيتي | ئەنهایدرایدی سرکە = ئۆکسیدی سرکی ( ئەسیتی ) |
| Acetic fermentation | تخمر خلي | سرکە ترشان = ترشانی سرکی |
| Acetify | حَمَّضَ، خَلَّلَ | ترشاندی، سرکاندی |
| Acetometer | مقياس حموضة الخل | پێوەری ترشێتیی سرکە، ترشێتیی سرکە پێو |
| Acetometry | مقياس حموضة الخل | پێوانی ترشێتیی سرکە، ترشێتیی سرکە پێوان |
| Acetone = dimethyl ketone | أسيتون = كيتون ثنائي المثيل | ئەسیتۆن = دوانە مەثیل کیتۆن |
| Acetosity | حموضة | ترشێتی |
| Acetyl $CH_3CO$- | أسيتيل، خليل | ئەسیتیل، سرکیل |
| Acetylate | أستل: أدخل شقاً أسيتيلياً | ئەستەلاندی ( سرکاندی ): ڕەگێکی ئەسیتیلیی تێخستن |
| Acetylation | أستلة | ئەسیتیلاندن |
| Acetyl devivatives = acetates | مشتقات الأسيتيل = أسيتات | وەرگرتەکانی ئەسیتیل = ئەسیتات |
| Acetylene | الأسيتيلين، غاز الأسيتيلين | ئەسیتیلین، گازی ئەسیتیلین |
| Acetylene black | أسود الأسيتيلين | ڕەشی ئەسیتیلین |
| Acetylene – blowpipe | حملاج الأسيتيلين | ئەسیتیلین فووکەرە |
| Acetylene burner | موقد أسيتلني | ئەسیتیلین سوتێن |

| | | |
|---|---|---|
| Acetylene cutting | قطع بالأسيتيلين | بڕینەوە بە ئەسیتیلین |
| Acetylene cylinder | أسطوانة أسيتيلين | لوولەکی ئەسیتیلین |
| Acetylene – generator | مولد الأسيتيلين | ئەسیتیلین دروستکەرە |
| Acetylene hydrocarbons | هيدروكربونات أسيتيلينية | هایدرۆکاربۆنە ئەسیتیلینییەکان |
| Acid | حامض | ترش |
| Acid aging | تعتيق بالحامض | بەترش کۆنکردن |
| Acid amide $CH_3CONH_2$ | أميد حامضي | ترشە ئەماید |
| Acid anhydride | أكسيدد لافلزي (يكون حامضا مع الماء) | ئۆکسیدی ناکانزا (لەگەڵ ئاو، ترش پێك دێنێت) |
| Acid bath | حمام حامضي، مغطس حامضي | گەرماوی ترش، نقومگەی ترش |
| Acid buffer | محلول منظم حامضي | گیراوەی ڕێکخەری ترش |
| Acid clay | طين حامضي | ترشە قوڕ |
| Acid cleaning | التنظيف بالحامض | ترشە پاككردنەوە |
| Acid concentration | تركيز حامضي | ترشە خەستی |
| Acid content | المحتوى الحامضي | ترشە ناوەرۆك |
| Acid corrosion | تآكل بالحامض | ترشە داخوران |
| Acid diluted | حامض مخفف | ترشی ڕوون |
| Acid dyes | أصباغ حامضية | ترشە بۆیەکان |
| Acid esters | أسترات حامضية | ترشە ئەستەرەکان |
| Acid etching | نمش بالحامض | بەترش نەخشاندن |
| Acid-fast | ثابت ضد الحوامض | دژی ترش جێگیر |
| Acid-forming | مولد الحامض | ترش دروستکەرە |
| Acid frac | حامض تصديع الصخر ـ تصديع بالحامض | ترشی بەردشکێن ـ بەترش شکاندن |
| Acid fumes | أدخنة حامضية | ترشە دووكەڵ |

| | | |
|---|---|---|
| Acid gas | غاز حامضي | ترشەگاز |
| Acid gel | جل حامضي | ترشەجێڵ |
| Acid, hydrochloric | حامض الهيدروكلوريك | ترشی هايدرۆكلۆريك |
| Acid hydrolysis | تميؤ حامضي، تحليل مائي حامضي | ترشە ئاوێن، ترشە ئاوەشيبووونەوە |
| Acidic | حامضي | ترشی |
| Acidic oxide | اكسيد حامضي | ئۆكسيدی ترش، ترشۆكسيد |
| Acidifiable | قابل للتحميض | ترشنۆك، توانستی ترشاندنی هەيە |
| Acidified | محمض | ترشێنراو |
| Acidity<br>Acidimeter | حموضة<br>مقياس الحموضة | ترشێتی<br>ترشێتيپێو، پێوەری ترشێتی |
| Acidization of a well | احماض البئر، معالجة بئر بالحامض | بيرترشاندن، چارەسەری بير بەترش |
| Acidize | حمض، عالج بالحامض | ترشاندی، بەترش چارەيكرد |
| Acidizer | مادة محمضة | ترشكەرە، ماددەيەكی ترشكەر |
| Acid lining | بطانة حامضية | ترشە ناوپۆش |
| Acid mordant dyes | أصباغ حامضية المرسخ | بۆيە جێگيركەر ترشەكان |
| Acid number | العدد الحامضي | ترشە ژمارە |
| Acid-oil ratio | نسبة الحامض الى الزيت | رێژەی ترش بۆ رۆن |
| Acidolysis | التحليل بالحامض | ترشە شيبوونەوە |
| Acid-proof | صامد للحامض | دژە ترش، ترشگرە |
| Acid-alloy | سبيكة صامدة للحامض | دارِشتەی دژە ترش |
| Acid-brick | طابوق صامد للحامض | خشتی دژە ترش |
| Acid-casting | صبة مقاومة | دارِشتنی دژە ترش |
| Acid-coating | طلية مقاومة للحامض | رووپۆشينی دژە ترش |
| Acid-lining | تبطين مقاومة للحامض | ناوپۆشينی دژە ترش |
| Acid-steel | فولاذ مقاوم للحامض | پۆڵای دژە ترش |

| | | |
|---|---|---|
| Acid radical | جزر ( شق ) حامضي | ڕەگی ترش |
| Acid recovery | استعادة الحامض | گێڕانەوە ( دەستخستنەوەی ) ترش |
| Acid refining | التكرير بالحامض | ترشە پاڵاوتن |
| Acid residue | متخلفات حامضية | ترشە پاشەڕۆ |
| Acid resistance | مقاومة حامضية | ترشە بەرگری |
| Acid-resisting | مقاوم للحامض | ترشە بەرگر، دژە ترش |
| Acid rocks | صخور حامضية | ترشە بەرد |
| Acid salt | ملح حامضي | ترشە خوێ |
| Acid settling drum | وعاء ترسيب الحامض | دەفری ترش نیشاندن |
| Acid slag | خبث ( معدني ) حامضي | ترشە کۆزەر ( ی کانەکی ) |
| Acid sludge | كُدادة حامضية | ترشە خڵتە ( قوڕ ) |
| Acid soil | تربة حامضية | ترشە خاك |
| Acid-soluble | ذواب في الحامض | لەترشدا تواوە |
| Acid solution | محلول حامضي | ترشە گیراوە |
| Acid strength | قوة الحامض | هێزی ترش |
| Acid, sulphuric | حامض الكبريتيك | ترشی گۆگردیك |
| Acid tar | قار حامضي | ترشە قار |
| Acid test | اختبار بالحامض | بەترش تاقیکردنەوە |
| Acid tester | مخبار الحامضية | پێوەری ترشێتی، ترشێتی تاقیکەرەوە |
| Acid-treated | معالج بالحامض | بەترش چارەکراو |
| Acid-treated clay | طين معالج بالحامض | قوڕی بەترش چارەکراو |
| Acidulate | إستحمض، أحمض قليلا | کەمێك ترشاندی |
| Acidulated water | ماء محمض | ئاوی ترشێنراو |
| Acidulation | تحميض | ترشاندن |
| Acidulous | محمض، قليل الحموضة | کەمترش، کەمترشێتی |
| Acid value | القيمة الحامضية | بەهای ترشێتی، ترشە بەها |

| | | |
|---|---|---|
| Acid washing | غسل بالحامض | ترشه شۆركردن |
| Acid well treatment | معالجة بئر النفط بالحامض | بەترش چارەكردنی بیره نەوت |
| Aciform | أبري الشكل | دەرزی شێوه |
| Aciniform | عنقودي الشكل | هێشویی، هێشوشێوه |
| Acknowledge | معترف به | ددان پێدانراو |
| Aclinal | لاميلي | نالاری |
| Aclinic line (or magnetic equator) | الخط اللاميلي، خط الاستواء المغنطيسي | نالاریی هێڵ، هێڵی کەمەرەیی موگناتیسی |
| Acme | قيمة، أوج، ذروة | لووتكه، ترۆپك، پۆپه |
| Acoustic(al) | صوتي، سمعي | دەنگی، بیستەکی |
| Acoustic communication | نقل صوتي | دەنگە گواستنەوه |
| Acoustic compensator | معادل ( أو معدل ) صوتي | هاوكێشکەر ( یان ڕاستکەرەوه )ی دەنگی دەنگە هاوكێشکەره، یان دەنگە ڕاستکەرەوه |
| Acoustic frequency | تردد صوتي | دەنگە چەندبارەبوونەوه |
| Acoustic horizon | افق صوتي | ئاسۆی دەنگی،دەنگە ئاسۆ |
| Acoustic intensity | الشدة الصوتية | تینی دەنگی،دەنگە تین |
| Acoustic measurement | القياس الصوتي | پێوانەی دەنگی، دەنگە پێوانه |
| Acoustic method | الطريقة الصوتية | ڕێگەی دەنگی،دەنگە ڕێگە |
| Acousticon | أكوستيكون : جهاز تلفوني حساس | ئەکۆستیکۆن : ئامێرێکی تەلەفۆنیی هەستناکە |
| Acoustic properties | الخصائص الصوتية | ڕەوشه دەنگییەکان |
| Acoustic receiver | مستقبل صوتي | دەنگ وەرگر، دەنگ وەرگره |
| Acoustic refraction | إنكسار الصوت | شکانەوەی دەنگ، دەنگ شکانەوه |

| | | |
|---|---|---|
| Acoustic resistance | مقاومة صوتية | بەرگریی دەنگ، دەنگە بەرگری |
| Acoustics | علم الصوتيات، السمعيات | دەنگزانی، بیستەنییەکان |
| Acoustic transmission | الإرسال الصوتي، النقل الصوتي | ناردنی دەنگ، دەنگ گواستنەوە |
| Acrolein resins | راتنجات الاكرولين | ڕاتنجەکانی ئەکرۆلین |
| Acrylic acid | حامض الأكريليك | ترشی ئەکریلیك |
| Acrylic fibers | ألياف اكريلية | ڕیشاڵی ئەکریلی |
| Acrylic resins | راتنجات اكريلية | ڕاتنجی ئەکریلی |
| Acrylonitrile | اكريلونيتريل، سيانيد الفنيل: مركب هيدروكربوني أزوتي، تستخرج من مبلمراته الأنسجة والمطاط. | ئەکریلۆنایتریل، سیانیدی فەنیل: ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنیی ئازۆتییە، چنراو و لاستیك لە پەلەرێنراوەکانی دەردەهێندرێت. |
| A.C.S (American Chemical Society) | الجمعية الكيميائية الأمريكية | کۆمەڵەی کیمیایی ئەمریکایی |
| Act | عمل، فعل | کار، ئیش |
| Acting force | قوة فاعلة | هێزی کارا |
| Actinic | أكتيني: محدث تغييرات كيمياوية بالإشعاع | ئەکتینی: پەیداکەری گۆڕانی کیمیایی بە تیشکدانەوە |
| Actinic radiation | اشعاع اكتيني | تیشکدانی ئەکتینی |
| Actinic rays | أشعة أكتينية | تیشکی ئەکتینی |
| Actinides | الاكتيفات: العناصر التي يزيد عددها الذري عن ٨٨ | ئەکتینەکان: ئەوتوخمانەن کە گەردیلە ژمارەکەیان لە ٨٨ زۆرترە. |
| Actinism | الأكتينية: فعالية الضوء الكيميائية | ئەکتینێتی: چالاکی کیمیایی ڕووناکی |

| | | |
|---|---|---|
| Actinium | أكتينيوم: عنصر مشع رمزه Ac | ئەکتینیۆم: توخمێکی تیشکنه هێماکەی (Ac)ه |
| Actinometer | اكتينومتر: مقياس شدة الاشعاع | ئەکتینۆ پێو: پێوەری تینی تیشکدانەوە |
| Action | عمل، فعل، تأثير | کار، ئیش، کاریگەری |
| Activate | نشط، زاد الفعالية | چالاکی کرد، کاراتری کرد |
| Activated | منشط | چالاککراو |
| Activated adsorption | امدصاص منشط | ڕوومژینی چالاککراو |
| Activated alumina | الومينا منشطة | ئەلومینای چالاککراو |
| Activated carbon | كربون منشط | کاربۆنی چالاککراو |
| Activation | تنشيط | چالاککردن |
| Active | نشط | چالاك، کارا |
| Activity | فعالية | چالاکی |
| Activity series of metal | سلسلة الفاعلية الكيمياوية للفلزات | زنجیرەی چالاکیی کیمیایی کانزاکان |
| Actual | واقعي | ڕاستەکی |
| Acyclic | لاحلقي | نائەڵقەیی |
| Acyl | الشق المتبقي من جزئ الحامض العضوي بعد ازالة الهيدروكسيل منه | ڕەگی ماوە، لەگەردی ترشی ئەندامی، پاش لێلابردنی هایدرۆکسیل |
| Acylation | تأسيل | ئەسیلێن |
| Acyl group CH٣C- | مجموعة أسيل | کۆمەڵی ئەسیل |
| Adamant | قاس، صلد أدمنت: حجر شبه ماسي – مادة صلدة | ڕەق، سەخت ئەدەمەنت: بەردێکی نیمچە ماسییە، ماددەیەکی سەختە |
| Adaptability | تكيفية، امكانية التكيف | گونجۆکێتی، توانستی گونجۆکی |
| Adaptable | متكيف | گونجۆك، گونجاو |

| | | |
|---|---|---|
| Addition | اضافة، جمع | خستنه سەر، کۆکردنەوه |
| Addition compound | مركب اضافة، مركب جمع | ئاوێتەی خستنه سەر، ئاوێتەی کۆکراوه |
| Addition polymer | بوليمر بالاضافة | پۆلیمەری کۆکراوه |
| Addition polymerization | بلمرة بالإضافة | پەلمەرێنی کۆکراوه |
| Additive | مضاف (كيمياوي) | خراوه سەر (ی کیمیایی) |
| Additive oil | زيت معالج بالاضافات الكيمياوية | رۆنی بەخستنە سەری کیمیایی چارەکراو. |
| Additive reaction | تفاعل جمعي | کارلێکی کۆیەکی |
| Adhesion | إلتصاق، تلاصق | لکان، پێوەلکان |
| Adhesive | لصوق، لاصق | لکۆك، لکێن |
| Adhesive force | قوة الالتصاق | هێزی لکێن |
| Adiabatic | ثابت الحرارة | گەرمینە گۆر |
| Adipic acid $C_6H_6O_4$ | حامض الأديبيك | ترشی ئەدیپیك |
| Adipcere | شمع دهني متفحم | مێوی رۆنیی خەلۆزیو |
| Adope | طابوق نيء | خشتی کاڵ |
| Adsorb | إمتز | رووەمژکرا، رووەمژرا |
| Adsorbate | ممتز | رووەمژکراو، رووەمژراو |
| Adsorbed | ممتز | رووەمژکراو، رووەمژراو |
| adsorbent | ممتز | رووەمژکراو، رووەمژراو |
| Adsorption | امتزاز | رووەمژکردن، رووەمژین |
| Adsorption gasoline | بنزين امتزاز طبيعي | بەنزینی رووەمژینی سروشتی |
| Aether (ether) | أيثر | ئیثه ر |
| Affinity | ألفة، ميل للتفاعل الكيمياوي | هۆگری، ئارەزوی کارلێکی کیمیایی |
| Agent | عامل | هۆکار |
| Agent, catalytic | عامل حفاز | هۆکاری هاندەر |

| | | |
|---|---|---|
| Agent, oxidizing | عامل مؤكسد | هۆكاری ئۆكسێن |
| Agent, reducing | عامل مختزل | هۆكاری لێكەرەوە |
| Age of the beds | عمر الطبقات الجيولوجية | تەمەنی چینە جیۆلۆجییەكان |
| Age resistors | مضادات التعتيق | دژە كۆناندن |
| Agglomerate | تراكم | كەڵەكەبوو |
| Agglomeration | تراكم | كەڵەكەبوون |
| Agglutinate | إلتصق | پێوەلكا |
| Agglutination | إلتصاق | پێوەلكان |
| Aggregate | تراكم، تجمع | كەڵەكەبوو، كۆبووەوە |
| Air-gas mixture | مزيج الغاز والهواء | تێكەڵی گازوهەوا |
| Airliquefation | إسالة الهواء | هەواشلكردنەوە |
| Air-slaking | إطفاء الجير بتعريضه للهواء | كوژاندنەوەی قسڵ، بەدانیە بەرهەوا |
| Air sweetening | التحلية بالهواء: إزالة المركبتان بالهواء أو بأكسجين الهواء. تحلية (النفط الكبريتي) بالتهوية | بەهەوا شیرینكردن: لابردنی مەركەپتان بەهەوا یان بە ئۆكسجینی هەوا، شیرینكردنی (نەوتی گۆگردار) بەهەواپێن. |
| Air washer tank | خزان تنظيف بالهواء | تەنكیی بەهەوا پاككردنەوە (شتن) |
| Air water preparation unit | وحدة تحضير الماء والهواء | بەشی ئامادەكردنی ئاووهەوا |
| Albata | الباتا: فضة المانية | ئەلباتا: زیوی جەرمەنی |
| Albertite | ألبرتيت: قار متحجر في الطبقات النفطية | ئەلبەرتایت: قیری بەردیوە لە چینە نەوتییەكاندا |
| Albino asphalt | ألباريت: خام معدني يتركب من سليكات الصوديوم والألومنيوم (فلسبار أبيض) | ئەلباریت: خاوێكی كانزاییە لە سلیكاتی سۆدیۆم و ئەلومنیۆم پێك دێت (فلسباری |

| | | |
|---|---|---|
| | | سپی ) |
| Alkalimeter = alkalimeter | مقياس القلوية | ئەلكالیپیۆ = پێوەری ئەلكالێتی |
| Alkaloid = alkaloid | قلواني. شبه قلواني | نیمچە ئەلكالی |
| Alclad | الكلاد : صفائح مركبة من ألومنيوم وديوراالومين | ئەلكلاد : پەڕەكەی لە ئەلومنیۆم و دیوراالامین پێكهاتوو |
| Alcohol | كحول | ئەلكهول |
| Alcohol , absolute | كحول مطلق | ئەلكهولی پەتی |
| Alcoholate | كحولات | ئەلكهولات |
| Alcohol content | المحتوي الكهولي | كهولە ناوەرۆك |
| Alcohol, ethyl | كحول الأثيل | كهولی ئەثیل |
| Alcohol fuel | وقود كحولي | كهولی سووتەمەنی |
| Alcoholic strength | التركيز الكحولي | خەستیی كهولی |
| Alcoholize | كحلل. حول الى كحول | كهولاندی. كردی بە كهول |
| Alcohol, methyl | كحول المثيل | كهولی مەثیل |
| Alcoholometer | مقياس الكحولية | كهولێتیپیێو |
| Alcoholometry | قياس الكحولية | كهولێتیپیێوان |
| Alcohols, higher | الكحولات العليا | كهولە باڵاكان |
| Alcohol thermometer | ترمومتر ( مقياس حرارة ) كحولي | تەرمۆمیتەر ( گەرمیپیێوی ) كهولی |
| Alcoholysis | كحللە . تفكك كحولي | كهولێن. كهولە شیبوونەوە |
| Alcosol | غرواني كحولي. محلول غرواني في الكحول | كهولەمڵ. مڵە گیراوەیەك لە كهولدا |
| Aldehyde | ألديهاير ( ناتج أكسدة الكحول جزئياً ) أسيتالديهيد | ئەڵدیهاید ( بەرهەمی بەشە ئۆكساندنی ئەلكهول ) ئەسیتاڵایهاید |
| Aldol | ألدول : مركب كيمياوي ينتج | ئەلدۆڵ : ئاوێتەیەكی |

| | | |
|---|---|---|
| | من تكثف الأسيتالديهايد | كيمياييه، لەخەستبوونەوەی ئەسیتاڵدیهاید پێك دێت |
| Alembic | إنبيق: جهاز تقطير | دڵۆپێن: دەزگای دڵۆپاندن (ئەلەمبیك) |
| Algin | ألجين. أشنيت: ملح الحامض الأشني | ئەلجین. قەوزەیین: خوێی ترشی قەوزەیە |
| Alginic acid | الحامض الأشني | ترشی قەوزەیی |
| Alicyclic = aliphatic/cyclic | دهني حلقي | ڕۆنی ئەڵقەیی = ئەلیفاتی – ئەڵقەیی |
| Alicyclic compounds | مركبات دهنية حلقية | ئاوێتە ڕۆنییە ئەڵقەییەکان |
| Aliphatic | دهني. أليفاتي | ڕۆنی. ئەلیفاتی |
| Aliphatic acids | حوامض دهنية أو أليفاتية | ترشە ڕۆنییەکان یان ئەلیفاتییەکان |
| Aliphatic alcohols | كحولات أليفاتية | کهولە ئەلیفاتییەکان |
| Aliphatic hydrocarbons | الهيدروكربونات الأليفاتية (ذات سلسلة مستقيمة) | هایدرۆکاربۆنە ئەلیفاتییەکان (زنجیرە ڕاستەکان) |
| Alizarin | أليزارين: صباغ أحمر يستخرج من قطران الفحم | ئەلیزارین: بۆیەیەکی سوورە، لەقەترانی خەڵووز دەردەهێنرێت |
| Alkali | قلي | ئەلکالی |
| Alkalify | قلى | ئەلکالاندی |
| Alkali liquor | محلول قلوي | گیراوەی ئەلکالی |
| Alkali (or alkaline) metals | فلزات قلوية | کانزا ئەلکالییەکان |
| Alkalimeter | مقياس القلوية | ئەلکالیپێو |
| Alkalimetry | مقياس القلوية | ئەلکالیپێوان |
| Alkaline | قلوي. قاعدي | ئەلکالی. تفت |
| Alkaline | مركم قلوي | باتریی تفت |

| | | |
|---|---|---|
| accumulator | | |
| Alkaline bath | مغطس قلوي | نقومگەی تفت |
| Alkaline detergents | منظفات قلوية | پاككەرەوەی تفت |
| Alkaline earths | أكاسيد معادن الأترية القلوية | ئۆكسیدی كانزا گلّییە ئەلكالییەكان |
| Alkaline process | عملية قلوية | كردەیەكی ئەلكالی |
| Alkaline reaction | تفاعل قلوي | كارلێكی ئەلكالی |
| Alkaline rocks | صخور قلوية | كەڤرە ( بەردە ) ئەلكالییەكان |
| Alkaline salt | ملح قلوي | خوێی ئەلكالی |
| Alkaline soil | تربة قلوية | خاكی ئەلكالی |
| Alkaline solution | محلول قلوي | گیراوەی ئەلكالی |
| Alkaline wash | غسل قلوي | شتنی ئەلكالی |
| Alkaline water | ماء قلوي | ئاوی ئەلكالی |
| Alkalinity | القلوية | ئەلكالیێتی |
| Alkali proof | صامد للقلويات | دژە ئەلكالی |
| Alkali-resistant | مقاوم للقلويات | بەرگرە ئەلكالی |
| Alkali rocks | صخور قلوية | بەردی ئەلكالی |
| Alkali strength | التركيز القلوي | خەستیی ئەلكالی |
| Alkali test | اختبار بالصددا الكادية | تاقیكردنەوە بەداخە سۆدا |
| Alkali treatment | معالجة قلوية | بەئەلكالی چارەكردن |
| Alkali wash | غسل قلوي | شتنی ئەلكالی |
| Alkalization | تقلية : جعل الشيء قلوياً | ئەلكەلاندن : شتێك بكرێت بە ئەلكانی |
| Alkalize | قلى | ئەلكالاندی |
| Alkaloid | شبه قلوي | نیمچە ئەلكالی |
| Alkanes | الكانات : فئة المركبات الهيدروكربونية الدهنية المشبعة | ئەلكانەكان : گرۆی ئاوێتە هایدرۆكاربۆنییە ڕۆنییە تێرەكان |
| Alkenes | الكينات : فئة المركبات | ئەلكینەكان : گرۆی ئاوێتە |

| | | |
|---|---|---|
| | الهيدروكربونية الدهنية غير المشبعة ( تحتوي على آصرة ثنائية أو أكثر ) | هايدرۆکاربۆنییە ڕۆنییە ناتێرەکان ( بەندێك یان زۆرتری دوانیی تێدایە ) |
| Alkynes (or alkines) | الكاينات : فئة المركبات الهيدروكربونية الدهنية غير المشبعة ( تحتوي على آصرة ثلاثية أو أكثر ) | ئەلکانیەکان : گرۆی ئاوێتە هایدرۆکاربۆنییە ڕۆنییە ناتێرەکانە ( بەندێك یان زۆرتری سیانیی تێدایە ) |
| Alkoxide | الكوكسيد : مركب فلزي كحولي | ئەلکۆکسید : ئاوێتەیەکی کانزایی ئەلکهولییە |
| Alkyl | الكيل : شق أليفاتي هيدروكربوني أحادي التكافؤ | ئەلکیل : ڕەگێکی ( کەرتێکی ) ئەلیفاتیی هایدرۆکاربۆنیی یەکە هاوهێزییە |
| Alkylate | ألكل : ضم شقاً الكيلياً الى الكيلات، مادة مؤلكلة | ئەلکەلاندی : کەرتێکی ئەلکیلیی خستنە سەر ئەلکیلێك، ماددەیەکی ئەلکیلێنراو |
| Alkylated aromatics | عطريات مؤلكلة | بۆنە مەنییە ئەلکیلێنراوەکان |
| Alkylating equipment | معدات الألكلة | کەلوپەلی ئەلکیلێن |
| Alkylation | ألكلة : اضافة شق هيدروكربوني ( أليفاتي أو أروماتي ) الى مركب أوليفيني | ئەلکیلێن : خستنە سەری بەشێکی هایدرۆکاربۆنییە ( ئەلیفاتی یان ئارۆماتی ) بۆ ئاوێتەیەکی ئۆلیفینی |
| Alkylation, acid | ألكلة حامضية | ترشە ئەلکیلێن |
| Alkylation gasoline | بنزين الكلة : عالي درجة منع الخبط | بەنزینی ئەلکیلێن : پلەی تەقەتەق نەهێشتن بەرز |
| Alkylation, hydrofluoric acid | ألكلة بحامض الهيدروفلوريك | بەترشی هایدرۆفلۆریك ئەلکیلێن ( ترشی هایدرۆفلۆریکە ئەلکیلێن ) |

| | | |
|---|---|---|
| Alkylation plant = alkylation unit | وحدة ألكلة. معمل ألكلة | بەشی ئەلكیلێن. كارگەی ئەلكیلێن |
| Alkylation process | عملية الألكلة | كردەی ئەلكیلێن |
| Alkylation reaction | تفاعل ألكلة | كارلێكی ئەلكیلێن |
| Alkyl benzene | بنزين أليفاتي أو الكيلي | بەنزینی ئەلیفاتی یان ئەلكیلی |
| Alkyl derivatives | مشتقات الكيلية | وەرگرتە ئەلكیلییەكان |
| Alkylene | ألكيلين: شق هيدروكربوني ثنائي التكافؤ | ئەلكیلین: كەرتێكی هایدرۆكاربۆنیی دوانە هاوهێزییە |
| Alkyl group | مجموعة الكيلية: (سلسلة هيدروكربونات غير مشبعة) | كۆمەڵەی ئەلكیلی (ئەلكیلە كۆمەڵە): (زنجیرە هایدرۆكاربۆنێكی ناتێرن) |
| Alkyl halides | هاليدات الكيلية. هاليدات الألكيل | هالیداتە ئەلكیلییەكان. هالیداتی ئەلكیل |
| Alkyl radical | شق ألكيلي أحادي التكافؤ | ڕەگی ئەلكیلی یەكە هاوهێزی |
| Alkyl-sulpher compounds | مركبات كبريتية ألكيلية | ئاوێتە ئەلكیل-گۆگردییەكان. ئاوێتە گۆگرد-ئەلكیلییەكان |
| Allomeric = allomerous | مماثل في التركيب البلوري (لا الكيمياوي) | چونیەك لە پێكهاتنی بلوری (نەك كیمیاییدا) |
| Allomerism | تماثل في التركيب البلوري (لا الكيمياوي) | چۆنیەكیی پێكهاتنی بلوری (نەك كیمیایی) |
| Allomorphic = allomorphous | مماثل في التركيب الكيمياوي (لا البلوري) | چونیەك لە پێكهاتنی كیمیاییدا (نەك بلوری) |
| Allomorphism = | تماثل في التركيب الكيمياوي (لا البلوري) | چونیەكی پێكهاتنی كیمیایی (نەك بلوری) |
| Allotment | حصة. تحصيص | بەش. بەشاندن |
| Allotripmorphic crystals | بلورات ناقصة الشكل | بلوری شێوە ناتەواو |

